أبو الفرج إبن الجوزي

# فرمێسکی پەشیمانی



وەرگێڕانی
هاوێر حاجی عوسمان



نـــاوی کتێـــــب: فرمێسکی پەشیمانی

نووسینــــــــــــی: أبو الفرج ابن الجوزی

وەرگێڕانــــــــی: هاوێر حاجی عوسمان

نـەخشەسازی ناوەوە: (کامران رفیق).

نورەو ســـاڵی چـــاپ: چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٧.

ژمـــــارەی سپـــاردن: () ی ساڵی (٢٠١٧) ی پێدراوە.

# پێشەكی

(ابن الجوزی) یەكێكە لە زانا گەورەكانی ئیسلام و خاوەن دەیان دانراوی بەنرخە، لە ساڵی ٥١٠ی كۆچی لە شاری بەغداد لەدایك بووە و زانست و زانیارییەكانی ئەو سەردەمەی لەسەر دەستی زانا و فەقیهە گەورەكانی ئەوسای جیهانی ئیسلام وەرگرتووە..سەرەتای ژیانی بە سۆفیگەریتی دەست پێكردووە، بەڵام دواتر وازی لە ڕێچكەی سۆفیگەریتی هێناوە و خووی داوەتە دانانی كتێب و ئامۆژگاریی موسڵمانان..لە بواری وەعز و ئیرشاددا وێنەی كەم بووە و هەزاران كەس بە هۆی مەجلیسەكانی ئامۆژگاریی ئەمەوە تەوبەیان كردووە..(ابن الجوزی) لە ئاكامی نەخۆشییەكەوە لە ساڵی (٥٩٧)ی كۆچی لە شاری بەغدا كۆچی دوایی كردووە و هەر لەوێش نێژراوە..

ئەم كتێبەی بەردەستت یەكێكە لە دانراوەكانی و تێیدا باس لە چەندان بابەتی ڕۆحیی گرینگ دەكات، كە بۆ هەموو موسڵمانێك پێویستە ئاگاداری بێت..

مرۆڤی ئیماندار بە هۆی سەرقاڵبوونی بە كاروباری دونیاوە زۆر جار تووشی ساردبوونەوە و دابەزینی ئیمان و دڵڕەقبوون دەبێت، ئەمەش كاردەكاتە سەر خواپەرستی و پەرستشەكانی و بایەخی

کەمتریان پێدەدات تا ئەوەی هەندێ جار ڕەنگە کەمتەرخەمیش لە ئەنجامدانیان بەڕێکوپێکی بکات، بۆیە ماوە ماوە پێویستی بەوەیە ئیمان و خواپەرستییەکەی دەمەزەرد بکاتەوە، ڕەنگە بۆ ئەمەش پێویست بەوە بکات کەسێك هەبێ لەو بێئاگایی و غەفڵەتە بەئاگای بێنێتەوە و دڵ و ناخی بە شەڕابی ئیمان تێراو و زیندوو بکاتەوە..(ابن الجوزی) لەم کتێبەیدا کتومت ئەم کارە دەکات و سەرتاپای بابەتەکانی بۆ ئەوەیە ئیماندار لە خەوی غەفڵەت بەئاگا بێنێتەوە و بیگەڕێنێتەوە سەر ڕاستەڕێی ئیمان و ئیسلام.

## یادی خوا

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێ: ﴿وَذَكِّـرْ فَـإِنَّ الـذِّكْرَى تَنْفَـعُ الْمُؤْمِنِينَ﴾(الذاريات: ٥٥)..

واتە: هەمیشە ئامۆژگاریی ئیمانداران بکە و بیریان بخەرەوە، چــونکە بەدڵنیاییـــەوە ئامۆژگـــاری و بیرخســـتنەوە ســـوود بـــە باوەڕداران دەگەیەنێت.

لـە فەرموودەیـەکی پێغەمبەریشـدا ﷺ هـاتووە، کـە دەفـەرموێ: خوای گەورە دەفـەرموێت: (أنـا عنـد ظـن عبـدي بـي، وأنـا معـه إذا ذكرني، فـإن ذكرنـي في مـلأ ذكرتـه في مـلأ خـير منـه، وإن ذكرنـي في نفسه ذكرته في نفسي، وإن تقـرب إلـيّ شـبراً تقربـت منـه ذراعـاً، وإن تقرّب إلي ذراعاً تقرّبت منه باعاً، وإن أتاني مشياً أتيته هرولة) حديث صحيح: رواه البخاري و مسلم و أحمد و الترمـذي و ابـن ماجـة و ابـن أبي الدنيا.

واتە: (مـن بەندەکـەم گومـانی چـۆن بێـت بەرامبـەرم وەهـا دەبم بۆی، ئەگەر یادم بکات و منی لەبیر بێت ئەوا لەگەڵیدام، ئەگەر لەناو کۆمەڵە خەڵکێکدا باسی کردم ئەوا منیش لەناو کۆمەڵەیـەکی باشـتر باسی دەکەم، ئەگەر لە کن خـۆی یـادی کـردم منـیش لـە لای خـۆم

ئاگام لێی دەبێت، ئەگەر بستێك لێم هاتەپێش و نزیك بوویەوە ئـەوا من قۆڵێك لێی دەچمەپێش، ئەگەر قۆڵێك لێم هاتەپێش ئەوا مـن بـە ئەندازەی دوو باڵ لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر بە ڕۆیشتن بۆ كنم هات من بە خێرایی بۆ لای دەچم.)

(عبـدالله كـوڕی عبـاس) - خـودا لێیـان ڕازی بێـت - لـە زاری پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: (من عجـز مـنكم عـن الليل أن يكابده و جبن عن العدو أن يقاتله و يبخل بالمـال أن ينفقـه فليكثـر ذكـر الله تعالى)حـديث ضـعيف: رواه الطبرانـي و الشـجري و البيهقي.

واتە: (ئەوەی ناتوانێ شەونوێژ بكات و بەهۆیەوە ماندوو و ڕەنـج دەكێشێ و، لە ڕووبەڕووبوونەوە و شەڕی دوژمن دەترسێ و لە مـاڵ بەخشینیش دەستقوچاو و قرچۆكە با لەبری ئەمانە زۆر یادی خـودا بكات).

قَالَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ : خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ، صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ ، فَقَالَ: " يَأَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ لِلَّهِ ، عَزَّ وَجَلَّ ، سَرَايَا مِنَ الْمَلائِكَـةِ تَحُلُّ وَتَقِفُ عَلَى مَجَالِسِ الذِّكْرِ فِي الأَرْضِ ، فَارْتَعُوا فِي رِيَاضِ الْجَنَّـةِ " . قَالَ : قَالُوا : وَأَيْنَ رِيَاضُ الْجَنَّةِ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَـالَ : " مَجَـالِسُ الذِّكْرِ فِي الأَرْضِ ، فَاغْدُوا وَرُوحُوا فِي ذِكْرِ اللَّـهِ ، عَـزَّ وَجَـلَّ ، وَذَكِّـرُوا

أَنْفُسَكُمْ ، مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَعْلَمَ مَنْزِلَتَهُ عِنْدَ اللَّهِ ، عَزَّ وَجَلَّ ، فَلْيَنْظُرْ كَيْفَ مَنْزِلَةُ اللَّهِ ، عَزَّ وَجَلَّ ، عِنْدَهُ ، فَإِنَّ اللَّهَ ، تَعَالَى ، يُنْزِلُ الْعَبْدَ مِنْهُ حَيْثُ أَنْزَلَهُ مِنْ نَفْسِهِ. " حديث ضعيف: رواه الحاكم و عبد بن حميد و البيهقی و أبو يعلی.

(جابری كوڕی عبدالله) – خودا لێی ڕازی بێت – دەڵێ: ڕۆژێكیان ئێمە لە مزگەوتی مەدینە دانیشتبووین پێغەمبەر ﷺ هاتە لامان فەرمووی: (خودا چەند كۆمەڵە فریشتەیەكی هەن، كە دەگەڕێن و سۆراغی مەجلیسەكانی زیكر و یادی خودا لەسەر زەوی دەكەن، ئەگەر ئێوەش باخەكانی بەهەشتتان بینی بڕۆنە ناوییەوە و پشوویەك بدەن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا باخەكانی بەهەشت چیین؟ فەرمووی: دانیشتنەكانی زیكر و یادی خودایە، بەیانی و ئێوارە لە یادی خوادا بن، هەر كەسێك دەیەوێ شوێن و پایەی لە لای خودا بزانێ با سەیری پێگە و پایەی خودا لە كن خۆی بكات كە چۆنە؟ چونكە خودا ئەو پلەوپایەیە دەداتە بەندەكەی، كە ئەو دەیداتە خودای خۆی)

وعن عبد الله بنِ بُسْرٍ رضي الله عنه أنّ رجُلًا قال: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ شَرَائِعَ الإِسْلَامِ قَدْ كَثُرَتْ عَلَيَّ، فَأَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ أَتَشَبَّثُ بِهِ.

قَالَ: (( لَا يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْبًا مِنْ ذِكْرِ اللهِ )). رواه التّرمذي—واللّفظ له—وقال:" حديث حسن غريب "، وابن ماجه، وابن حبّان في "صحيحه"، والحاكم، وقال: "صحيح الإسناد.

(عبدالله کوڕی بسر) دەڵێ: پیاوەك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمانەکانی ئیسلام لەسەرم زۆر بووە، بە شتێك فەرمانم پێ بکە کە پێی جێگیر ببم و دەستی پێوە بگرم..پێی فەرموو: (با هەمیشە زمانت بە یاد و زیکری خوداوە پاراو بێت.)

**براکانم:**

"اذا صعدت الملائكة من مجالس الذكر، قال المولى جل علاه: يا ملائكتي، أين كنتم، وهو أعلم، فيقولون: يا ربنا، أنت أعلم، كنا عند عبادك يسبّحونك ويقدّسونك ويعظمونك ويمجّدونك ويسألونك ويستغفرونك ويستعيذونك، فيقول: يا ملائكتي، وما الذي طلبوا؟ ومما استعاذوا؟ فيقولون: يا ربنا أنت أعلم، طلبوا الجنة، واستعاذوا من النار، فيقول: يا ملائكتي، اشهدوا أنّي قد أعطيتهم ما طلبوا، وأمنتهم مما خافوا، وأدخلتهم الجنة برحمتي". رواه مسلم.

(کاتێ فریشتەکان لە مەجلیسەکانی زیکر و یادی خودا هەڵدەستن و دەچنەوە لای خودای گەورە، خودا ئەگەرچی خۆی بە هەموو شتێك ئاگادارە، لێیان دەپرسێ: ئەوە لە کوێ بوون؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەی خودایە تۆ خۆت باشتر دەزانیت و ئاگاداریت، ئێمە لە لای بەندەکانت بووین، تەسبیحاتی تۆیان دەکرد و پاك و بێگەردیان ڕادەگرتی، بە گەورە و مەزن و پایەداریان دادەنایت و لێت دەپاڕانەوە و داوای لێخۆشبوونیان لێدەکردی..خودای گەورە دەفەرموێت: ئەی فریشتەکانم شایەت بن ئەوا من ئەوەی داوایان کردووە پێمدان و لەوەی دەترسان دڵنیام کردن و بە ڕەحمەت و دلۆڤانیی خۆم خستمنە بەهەشتەوە).

## وریای سەرپێچیی فەرمانەکانی خودا بە

لە هەندێ کتێبی ئاسمانییدا هاتووە: (ئەی بنیادەم، چەندە سەیریت! داوای شتێکم لێ دەکەیت و منیش لەبەرئەوەی دەزانم چ شتێك لە قازانج و بەرژەوەندی تۆدایە بۆیە پێتی نادەم، پاشان تۆ هەر سووریت لەسەری و هەر داوای دەکەیت، منیش بە ڕەحمەت و بەخشندەییی خۆم خواستەکەت جێبەجێ دەکەم و پێتی دەدەم تۆش دەچیت بەو بەخششانەی من سەرپێچیم دەکەیت و تاوان ئەنجام دەدەیت، منیش نیاز دەکەم ئابڕووت ببەم، چەندان شتی

جوان و نایابت بۆ دەکەم، لە بەرانبەردا تۆش چەندان کردەوەی ناشیرین و کرێت دەکەیت، نزیکە وەها خەشمت لێ بگرم کە هەرگیز لێت ڕازی نەبمەوە).

لە هەندێ کتێبی ئاسمانیی تردا هاتووە کە خودای گەورە دەفەرموێت: (بەندەکەم، تا چەند و کەی لە سەرپێچیکردنم بەردەوام دەبیت لە کاتێکدا من بە ڕۆزی خۆم نانم داویت و چاکەم لەگەڵ کردوویت، ئەی بە دەستی خۆم دروستم نەکردوویت؟! ئەی لە ڕۆحی خۆم فووم تێ نەکردوویت؟! ئەی نەتزانیوە ئەوەی گوێڕایەڵیم بکات چی بۆ دەکەم و ئەوەشی سەرپێچیم بکات چۆنی سزا دەدەم؟!

هەوەس و ئارەزوو، چاوی ناخ و دڵتی کوێر کردووە. پێم بڵێ: بە چی دەمبینی؟ ئەوا ئامۆژگاریم کردی ئیتر تاکەی سست و تەنبەڵی دەکەیت؟ ئەگەر تەوبەت کرد و لە تاوانەکەت پەشیمان بوویتەوە ئەوا ئاواتەکانت بۆ بەدی دێنم..واز لەم دونیایە بێنە کە خۆشییەکانیشی هەر ناخۆشین و ئاواتەکانی وەهمی خەیاڵاوی و بێجێن، پەیوەندیی منت بە شتێکی نزم گۆڕییەوە و دواتر لە دونیای ئەولا من بۆ پەرستن نابینیەوە، وەڵامت چی دەبێت ئەو کاتەی

ئەندامەکانی لەشت شایەتیت لەسەر دەدەن: ﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ ما عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُحْضَرًا﴾(ال عمران: ٣٠)..

شاعیرێکیش وتوویەتی:

تعصي الاله وأنت تزعم حبه      هذا محال في القياس بديـع

لو كان حبك صادقا لأطعتـه      إن المحب لمن يحب مطيع

خۆشەویستیی خودا و سەرپێچیکردنی خودا یەکناگرنەوە، ئەگەر کەسێك خۆشەویستییەکەی ڕاستگۆیانە بێت دەبێ گوێڕایەڵی خـودا بکات، چونکە خۆشەویست گوێڕایەڵی خۆشویستراو دەبێت.

## بەسەرهاتی مالیك لەگەڵ تاوانبارێکدا

مالیك کوڕی دینار دەگێڕێتەوە و دەڵێ: سەردانێکی دراوسـێیەکم کرد کە لە سەرەمەرگدا بوو، بێهۆش دەبوو و بەخۆ دەهاتەوە، ئاه و نزولەی لە ناخەوە دەهاتەدەر و پێشتر پشت لە خوا و ڕوو لە دونیـا بوو..پێم گوت: براکەم تەوبە بکە و واز لە گومڕایی بێنە بەڵکو خودا شـیفات بـدات و لـە نەخۆشـییەکەت چـاك بیتـەوە و هەسـتیتەوە، ئەویش بە دلۆڤانیی خۆی لێـت خـۆش ببێـت..گوتی: زۆر دوورە زۆر دوورە، ئەوەی کە دەبوو بێت وا نزیك بۆتەوە و بێگومان من دەمرم،

هەزار داخ و ئەسەف بۆ ئەو تەمەنەی بەخۆڕایی و بە بەتاڵی بەڕێم کرد، ویستم لەو تاوانانەی کردوومە تەوبە بکەم بەڵام لە گۆشەی ماڵەوە گوێم لە یەکێك بوو دەیگوت: چەندان جار بەڵێن و پەیمانمان پێتدا بەڵام هەموو جار تۆ دەتشکاندن!!..

پەنا بە خوا دەگرین لە چارەنووسی خراپ و لە تاوانە کەڵەکەبووەکانیش، داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەین.

**کەواتە براکەم:**

ڕووبکەرە خودا و واز لە سەرلێشێواوی و ئارەزووەکانت بێنە، ئەو تەمەنەی ماوتە لە گوێڕایەڵیی خودا بەسەری ببە و لەسەر ئارەزووە کاتییەکان ئارام بگرە، بە هەموو جۆرێك لە تاوان و گوناهەکان دووركەوە، ئەگەر لە دونیا ئارام بگریت لەسەر خواپەرستی ئەوا ئەمە بۆت دەبێتە پەرژینێك لە ئاگری دۆزەخ.

| | |
|---|---|
| مولاي إني عبد ضعيف | أتيتك أرغب فيما لديك |
| أتيتك أشكو مصاب الذنوب | وهل يشتكي الضر إلا إليك |
| فمُنَّ بعفوك يا سيدي | فليس اعتمادي إلا عليك |

خودایە من بەندەیەکی کزۆڵی تۆم هاتووم ئومێدم بەوەی لای تۆیە، هاتووم لە دەست تاوانەکانم هاتوهاوارمە، مەگەر بۆ لابردنی

ناخۆشــی هــەر نــابێ ڕوو لــە تــۆ بکرێــت؟ دەی کەواتــە خودایــە لێبووردەییی خۆتم بەسەردا ببارێنە و لێم خۆشبە چونکە هەر تۆیت پشت و پەنام.

## تەوبەی بەندەیەکی لەخواترس

پیاوچاکێکی لـەخواترس لـە سـەرەمەرگدا بـە کوڕەکـەی گـوت: کوڕم گوێ لە وەسیەتەکەم بگرە و ئەوەی پێتی دەڵێم بیکە..کوڕ: بەڵێ بابەگیان..

باوک: کوڕەکەم، پەتێك لە ملم بکـە و ڕامکێشـە و ڕوومـەتم لـەناو خۆڵدا بگەوزێنـە و بڵـێ: ئەمـە سـزای ئـەو کەسـەیە کـە سەرپێچـی خوداکەی دەکات..

کاتێ ئەوەی پێ کرا، دەستی بۆ ئاسمان بەرز کـردەوە و گـوتی: خوداکەم، گەورەکەم، ئێستا کاتی گەڕانەوە بۆ لای تۆ هاتووە، هیچ بیانوویـەکم نییـە بـەڵام ئەوەنـدە هەیـە تـۆ بەخشـندەیت و منـیش یاخی، تۆ دلۆڤانیت و من تاوانبار، تۆ گەورەیت و من بەندە، خودایە ڕەحم بە سەرکزی و داماویم بکە، هەموو توانا و هێزێك لە تۆوەیە...

دوای ئەم ئاه و نزولـە و لالانەوەیـە گیـانی دەرچـوو..دوای ئەمـە دەنگێك لە گۆشەی ماڵەکەوە هات کە هـەموو ئەوانـەی لـەوێ بـوون

گوێیان لێ بوو کە دەیگوت: بەندەکە خۆی بۆ خودا زەلیل و ملکەچ کرد و لەو تاوانانەی کردبوونی داوای لێخۆشبوونی کرد، خوداش لە خۆی نزیکی کردەوە و بەهەشتی پێ بەخشی.

## براکانم:

لای تەوبەکار خۆشەویستی خودایە، پەروەردگار ئەو کەسانەی خۆش گەرەکە کە لە بەردەم ئەودا خۆیان زەلیل و داماو دەکەن..گوتراوە کە خودا لە بەرامبەر ئەو جۆرە کەسانەدا دەفەرموێت: (من لەگەڵ ئەو کەسانەم و خۆشیانم دەوێن کە لەپێناو مندا دڵیان تواوەتەوە).

## شەونوێژی

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە: ئەگەر بەندەیەك گەڕایەوە لای خودا و کردەوە و خووی باش بوو، شەوانە بۆ لاڵانەوە لە خودا هەڵساوە ئەوا فریشتە چرایەکی نوورین هەڵدەکات و لەنێوان ئاسمان و زەویدا هەڵیدەواسێ، فریشتەکان دەپرسن: ئەمە چییە؟

ئەویش پێیان دەڵێ: فلانی کوڕی فیسار ئەمشەو لەگەڵ خودای خۆی ئاشت بووەوە.

لـە فەرموودەیەکیشـدا هـاتووە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: (ئەگەر بەندەیەك بە شەو هەڵسایەوە ئەوا ئەندامەکانی لەشی بانگی یـەکتر دەکـەن و دەڵـێن: ئـەوا خاوەنەکـەمان بـۆ خزمـەتی خـودا هەستایەوە.)..

(أحمـد کـوڕی أبـی الحـواری) دەگێڕێتـەوە و دەڵـێ: چـوومە لای (أبی سلیمان الـدارانی) بینـیم دەگریـا، پـێم گـوت: بۆچـی دەگـری؟ گـوتی: ئەحمـەد، ئـەهلی خۆشەویسـتی کـاتێ شـەو دادێ دەسـت دەکەن بە نوێژ و پاڕانەوە و فرمێسك دەبارێنن، کاتێ خودای گەورە لـەم دۆخـەدا دەیـانبینێ دەفـەرموێت: ئـەی جیبریـل، بـانگی ئـەم بەندانەم بکە بۆچی وا پەشۆکاون و نیگـەرانن؟ کەسێك هەیـە پێـی گوتبن کە خۆشەویستێك دۆستەکانی بە ئاگر سزا دەدات؟! ئایـا لـە مـن دەوەشـێتەوە شـەو لای خـەڵکانێك بم و دواتـر فـەرمان بکـەم بخرێنـە نـاو ئاگرەوە؟! ئەمـە لـە شـانی کۆیلەیـەکی بـەدیش ناوەشـێتەوە چ جـای پاشـایەکی بـەڕێز و شکۆدار. سـوێندم بـە گەورەیی و دەسەڵاتی خۆم خواردووە کە دیاریی من بۆ ئەوان بریتی دەبێت لـەوەی ڕووی خۆمیـان پیشـان بـدەم، تەماشـایان دەکـەم و تەماشام دەکەن.) ئەم گێڕانەوەیە لە کتێبـی (حلیـة الاولیـاء)ی أبـو نعیم هەیە.

# بەشی یەکەم

## ئەی دیلی دونیا وریابە

ئەی دیلی دونیا، بەندەی خودا، ئەی ئەوەی دڵت کردۆتە لانەی گوناه: بێنەوە یادت کە چیت کردووە و چ کارێکت بۆ ئەو دونیا پێش خستووە، لەوە بترسە خوای گەورە کە ئاگای لە تاوانەکانتە، لێت تووڕە بێت و دەرگای بە ڕووتدا دابخات و لە خۆیت دوور بخاتەوە و لە هاوڕێیەتیی خۆشەویست و دۆستانی ڕێگریت لێ بکات، ئەو کات بکەویتە چاڵی پشت تێکردن و ڕەنجەڕۆ بیت، هەر کات بتەوێ لە سەرلێشێواوی و گومڕایی ڕزگارت بێت، بە زمانی حاڵ بانگت بکات و پێت بڵێ:

| | |
|---|---|
| إليك عنّا فما تحظى بنجوانا | يا غادرا قد لهى عنّا وقد خانا |
| أعرضت عنا ولم تعمل بطاعتنا | وحيث تبغى الرضا والوصل قد بانا |
| بأي وجه نراك اليوم تقصدنا | وطال ما كنت في ألايام تنسانا |
| يا ناقض العهد ما في وصلنا طمع | إلا لمجتهد بالجد قد دانا |

لێمان دووركەوە تۆ چیتر لە قسەی ئێمە بەهرەدار نابیت، تۆ پشتت لە ئێمە کرد و گوێڕایەڵیت نەکردین و ڕەزامەندیی ئێمەت بە لاوە گرینگ نەبوو، ئەمڕۆ بە چ ڕوویەکەوە ڕوومان تێ دەکەیت کە چەندان ساڵە فەرامۆشت کردووین..ئەی پەیمانشکێن پەیوەندیی

ئێمە تەنها بۆ کەسانێکە کە لە بەندایەتیی ئێمەدا ماندوو دەبن و ڕەنج دەکێشن.

## گۆڕینەوەی دواڕۆژ بە دونیا

ئەی ئەوەی دواڕۆژت بە دونیا فرۆشتووە، بۆت دەرنەکەوتووە چ زیانێکت کردووە؟! ڕۆژانی بەیەکگەیشتن(وصال) چەند شیرینن و ڕۆژانی دابڕان(هجران) چەندە تاڵن..خەڵکێك هەن بە شەوبێداری و قورئان خوێندن و خوداپەرستی ژیانی خۆیان شیرین کردووە.

(عبدالعزیز کوڕی سلمان)ی خواناس دەڵێ: (مطهر السعدي) کە لە شەوق و پەرۆشیی بۆ خودا شەست ساڵی بە گریان بردەسەر، بۆی گێڕامەوە: لە خەوندا بینیم لە کەناری ڕووبارێکی میسکدا بووم، کە لێوارەکانی هەموو درەختی مرواری بوون و شیشەی زێڕی تێدا بوو، لە تەنیشت ڕووبارەکەوە چەند کچێکی گۆرانیبێژێك هەبوون بە یەك دەنگ دەیانگوت: پاك و بێگەردی بۆ خودا، بە هەموو زمان و چەشنێك پاك و بێگەردی بۆ خودای گەورە، ئێمە نەمرین و هەرگیز نامرین، ئێمە ڕەزامەندین و هەرگیز تووڕە نابین، ئێمە نەرم و ناسکین و هەرگیز پیر نابین.. منیش پێم گوتن: ئێوە کێن؟ گوتیان: دروستکراوێکی خودای گەورەین، گوتم: چی دەکەن؟ بە دەنگێکی خۆش گوتیان:

ذرأنا إله الناس رب محمد لقوم على ألاطراف بالليل قوَّمُ
يناجون رب العالمينْ إلههم وتسرى هموم القوم و الناس نوَّم

خودای گەورە، پەروەردگاری موحەممەد ئێمەی بۆ کەسانێك دروست کردووە کە شەوبێدارن و لە خودای خۆیان دەپاڕێنەوە.

گوتم: پەح پەح، ئەوانە کێن کە خودا بەختەوەری کردوون؟ گوتیان: نایانناسیت؟ گوتم: نا بە خوا..گوتیان: ئەوان کەسانێکی شەوبێداری قورئان خوێنن..

لە پێغەمبەر گێڕدراوەتەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (ئەگەر بەندەیەك تاوانێکی کرد و دواتر تەوبەی کرد و کردەوەی باشی کرد، خوای گەورە هەموو کردەوەیەکی باشی لێ وەردەگرێ و لە هەموو تاوانێکی خۆش دەبێ و بە هەر تاوانێك کە کردوویەتی پلەیەك لە بەهەشت بەرزی دەکاتەوە و بە هەر چاکەیەکیش کۆشکێکی لە بەهەشت دەداتێ و حۆرییەکی لێ مارە دەکات).

هەروەها لە پێغەمبەر ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە فەرموویەتی: (خوای گەورە سروشی بۆ (داوود) کرد: ئەی داوود، مژدە بە تاوانباران بدە و ڕاستگۆیانیش بترسێنە. داوود سەری سوڕما و گوتی: خودایە چۆن مژدە بە تاوانباران بدەم و ڕاستگۆیان بترسێنم؟ خودا فەرمووی: بەڵێ، مژدە بە تاوانباران بدە، کە هیچ تاوانێك ئەوەندە

بە گەورە نەگرن کە لێخۆشبوونی من نەیگرێتەوە، ڕاستکۆیانیش بترسێنە کەوا بە کارەکانیان سەرسام نەبن و خۆیان لێ نەگۆڕێ..

داوود، ئەگەر تۆ پێتوایە منت خۆش دەوێ خۆشەویستیی دونیا لە دڵت دەربێنە، چونکە خۆشەویستیی من و خۆشەویستیی دونیا لە دڵێکدا کۆنابنەوە..داوود، ئەگەر کەسێك منی خۆشبوێت ئەو کاتەی خەڵك دەخەون ئەو بێدارە و شەونوێژم بۆ دەکات، ئەگەر خەڵك لێم بێئاگا بوون ئەو لە تەنیاییدا یادم دەکات، ئەگەر خەڵك بەرانبەر نیعمەتەکانم سپڵە بوون ئەو سوپاسگوزاریم دەکات.

عن ابن عمر عن النبي ﷺ" البر لا يبلى، والذنب لا يُنسى، والديان لا يموت، ابن آدم اصنع ما شئت فكما تدين تدان" حديث ضعيف: رواه الديلمي و البيهقي و أحمد.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (چاکە کۆن نابێ، تاوانیش لەبیر ناکرێ، خوای گەورە لەناوناچێت، چۆنت دەوێ وابە، چی بچێنی ئەوە دەدورییەوە)

کابرا دەبینی چیت کردووە؟ نزیکت بە دوور فرۆشت، چاکەت بە ئارەزوو گۆڕییەوە، دینت بە دونیا سەودا کرد..

## گریان لە ترسی خودا

پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: (ئەی پێغەمبەری خودا، بە چی خۆم لە ئاگر بپارێزم؟ فەرمووی: بە فرمێسکی چاوەکانت.. گوتی: چۆن بە فرمێسکی چاوەکانم خۆمی لێ بپارێزم؟ فەرمووی: لە ترسی خوا فرمێسك ببارێنە، چونکە خودا چاوێك سزا نادات کە لە ترسی ئەودا گریابێت..)حدیث ضعیف جدا: رواه الخطیب في (تأریخ بغداد) و المنذری فی (الترغیب و الترهیب).

هەروەها (عبدالله کوڕی مسعود) لە زاری پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتییەوە کە فەرموویەتی: (دڵۆپە فرمێسکێك لە ترسی خودا لە چاوی ئیماندار بێتە خوارەوە بۆی باشترە لە دونیا و خواپەرستی ساڵێك، بیرکردنەوەی سەعاتێك لە گەورەیی و توانای خودا باشترە لە ڕۆژوو و شەونوێژی شەست ساڵ..ئاگاداربن خودا چەند فریشتەیەکی هەن هەموو ڕۆژ و شەوێك کەسانی تەمەن چل ساڵ بانگ دەکەن: خەرمانەکەتان کاتی دروێنەی هاتووە، کەسانی پەنجا ساڵ بانگ دەکەن: یاڵلا بۆ حیساب بەڕێکەون، کەسانی شەست ساڵ بانگ دەکەن: چیتان پێش خستووە و چیتان دوا خستووە؟ کەسانی حەفتا ساڵ بانگ دەکەن: چاوەڕێی چی دەکەن؟

خۆزگە خەڵك دروست نەکرابان، کە دروستیش کران خۆزگە دەیانزانی بۆچی دروست کراون و کاریان بۆ ئەوە کردبایە، ئاگادار بن وا ئەجەلتان نزیك بۆتەوە، بۆیە وریا بن.) أبو نعیم لە (الحلیة) بە کورتی لە وتەیەکی (وهب بن منبه)ی وەرگرتووە.

## دونیا فریوی داویت و تۆش نابیستی و نابینی

خودای گەورە بە مرۆڤ دەفەرمویٚ: ئەی بەندەی خراپ، چەندە سەرپێچی دەکەیت و من دایدەپۆشم، چەندە دەرگای قەدەغەکراوەکان دەشکێنیٚ، چەندە چاوەکانت داوای فرمێسکی ترست لیٚ دەکەن و تۆش فرمێسك نابارێنی، چەندە داوات لیٚ دەکەین بە گوێڕایەڵی پەیوەندیت لەگەڵمان هەبیٚ و تۆش ڕادەکەیت و پشتمان تیٚ دەکەیت، چەندە نیعمەتم بەسەر تۆوە هەیە و تۆش بەندەیەکی سوپاسم ناکەیت، دونیا و ئارەزووبازی فریوی داویت و تۆش نابیستی و نابینی، هەموو بوونەوەرم بۆ ژێربار کردوویت و تۆش یاخی دەبیت و بەدنمەکی دەکەیت، داوای مانەوە لە دونیا دەکەیت و نازانیت کە دونیا تەنها پردێکی پەڕینەوەیە بۆ دوارۆژ.

## مەجوسییەك بەر ڕەحمەتی خوا دەکەوێت و موسڵمان دەبێت

لە حەسەنی بەسرییەوە گێڕدراوەتەوە کە گوتوویەتی: سەردانی مەجوسییەکم کرد کە ماڵی بەرامبەر ماڵەکەم بوو، دراوسێیەکی باش و ڕەوشت جوان بوو، لەسەرەمەرگدا بوو، هیواخواز بووم لە کاتی مردنیدا خودا هیدایەتی بدات و لەسەر ئیسلام بیمرێنێت، پێم گوت: چیتە و وەزعت چۆنە؟ گوتی: دڵم نەخۆشە و جەستەم نەساغە و هێزم نییە، گۆڕیش چۆڵە و هاودەمێکم نییە، گەشتەکەشم درێژە و توێشووم نییە، ڕێگاکەش تەنگ و باریکە و پەڕینەوەم نییە، ئاگری دۆزەخیش گەرمە و جەستەم بەرگەی ناگرێ، بەهەشتیش بەرزە و بەشم لێی نییە، خوداش دادپەروەرە بەڵام من بەڵگە و بیانووم بەدەستەوە نییە..

حەسەنی بەسرییش دەڵێ: هیوام خواست خودا هیدایەتی بدات، بۆیە ڕووم تێکرد و پێم گوت: بۆچی موسڵمان نابیت تا سەلامەت بیت؟ گوتی: یا شێخ کلیلەکە بە دەست خواوەیە و قفڵەکەش وا لێرەیە..ئاماژەی بۆ سینگی کرد و ئیتر بوورایەوە.

حەسەنی بەسرییش دەڵێ: گوتم: ئەی خودای گەورە، ئەگەر ئەم مەجوسییە پێشتر چاکەیەکی لای تۆ هەبووە بەر لەوەی ڕۆحی لە دونیا ببڕێ تکایە پاداشتەکەی بۆ بنێرە..ئیتر لە بێهۆشییەکەی

بەئاگا هاتەوە و چاوەکانی کردنەوە و گوتی: یا شێخ خودای گەورە کلیلەکەی نارد، دەستت بێنە من موسڵمان بووم: أشهد أن لا إلـه إلا الله و أشهد أن محمدا رسول الله..پاشان گیـانی دەرچـوو و چـووەوە بەر دلۆڤانیی خودا..

## وریای غەفلەت بە

## براکانم:

بۆچـی بـە ئاگاییيـەوە وا بێئاگـان؟! بۆچـی بـە هۆشـيارييەوە سەرخۆش و مەستن؟! چـۆن وا لێـی دانیشـتوون لـە کاتێکدا ئێـوە داواکراون؟! چۆن وەها لێی پاڵکەوتوون لە کاتێکدا ئێوە ڕێبـوارن و دەبێ سەفەر بکـەن؟! کـاتی ئـەوە نـەهاتووە نووسـتووان لـە خـەو ڕابن؟ کاتی ئەوە نەهاتووە بێئاگایان پەند وەرگرن؟

بزانە کە هەموو خـەڵکی ئـەم دونیایـە وان لەسـەر سـەفەر، بۆيـە کارێك بۆ خۆت بکە تا ڕۆژی دوایی ڕزگار بیت لە سەقەر..

آن الرحيل فكن على حذر ... ما قد ترى يغني عن الحذر
لا تغتر بـــاليوم أو بغــد ... قلوب المغرورين على خطر

کاتی کۆچکردن هاتووە بۆیە وریا بە، بەمرۆ و سبەی هەڵمەخەڵەتێ چونکە دڵی هەڵخەڵەتاو و لەخۆباییبیان لە مەترسیدایە.

جونەیدی بەغدادی دەڵێ: (سری السقطي) بەردەوام سەرقاڵ بوو بۆیە ئەگەر شتێك لە ویردەکانی لەدەست چووبایە نەیدەتوانی بیگێڕێتەوە.

هەروەها عومەری کوڕی خەتاب – خودا لێی ڕازی بێت– کاتی نەبوو تێیدا بخەوێ، بۆیە هەر بە دانیشتنەوە دەبوژڕا و سەرخەوێکی دەشکاند..پێی گوترا: ئەی میری ئیمانداران ناخەویت؟ گوتی: چۆن بخەوم؟! ئەگەر بە ڕۆژ نووستم مافی خەڵك دەخۆم، ئەگەریش بە شەو خەوتم ئەوا بەشی خوام لەدەست دەچێ.

لە جونەید بیستراوە کە گوتوویەتی: هیچ کەسێکم نەبینیوە هێندەی (سري السقطي) خواپەرست بێت، حەفتا و هەشت ساڵ هەرگیز نەبینراوە پاڵکەوتبێ تەنها لەو نەخۆشییەی نەبێت، کە بەهۆیەوە کۆچی دوایی کردووە.

هەر جونەیدی بەغدادی دەڵـێ: گـوێم لـە (سـري السـقطي) بـوو دەیگوت: ئەگەر نوێژی جومعە و جەماعەت نەبووایە هەرگیز لە مـاڵ دەرنەدەچووم و تا مردن لە ماڵ دەمامەوە.

ئـەبو بـەکری سـەیدەلانی دەڵـێ: گـوێم لـە سـەلیمی کـوڕی مەنسووری کوڕی عەممار بوو دەیگوت: باوکمم لـە خەونـدا بینـی و پێم گوت: خودا چی پێ کـردی؟ گـوتی: خـودا نزیکـی خسـتمەوە و پێی گوتم: ئەی شێخی بەد، دەزانی بۆچـی لێـت خۆشـبووم؟ گـوتم: نەخێر ئەی خوای گەورە..خودا فەرمووی: تۆ ڕۆژێك لـە مەجلیسـێك دانیشتیت و خەڵکت گریاند، بەندەیەك لە بەندەکانم کـە هـەرگیز لـە ترسی من نەگریابوو لەوێ بوو و گریا منیش لێـی خۆشـبووم، لەبـەر خاتری ئەو لە هەموو ئەهلی مەجلیسەکە و تۆش خۆشبووم.

# بەشی دووەم

## وریای هێرشی ئەجەل بن

## براکانم:

تا کەی کارکردن دوا دەخەن و بە هیوای گەیشتن بە ئاواتن؟! بە مۆڵەتی خودا هەڵدەخەڵەتێن و بیر لە هێرشی ئەجەل ناکەنەوە؟! ئەوەی هەتانە لە منداڵ هەمووی خۆراکی خاکە، ئەوەی بنیاتتان ناوە وێران دەبێ، ئەو سەروەت و سامانەی کۆتانکردۆتەوە دەڕوات، ئەو کار و کردەوانەشی کردووتانە ئەوا لە کتێبێکدا نووسراوە و بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە هەڵگیراوە.

ولو أنّا إذا متنا تُرِكنا لكان الموت راحة كل حي

ولكنـــا إذا مِتنا بُعِثنا ونُسئلُ بعدها عن كل شيء

ئەگەر مردین و وازمان لێهێنرا ئەوا مردن حەسانەوەیە بۆ هەموو زیندوویەك، بەڵام ئەگەر مردین زیندوو دەکرێینەوە و دواتر لە هەموو شتێك لێمان دەپرسرێتەوە.

## چارەنووسی تاوان

لە عومەری کوڕی خەتابەوە گێڕدراوەتەوە کە گوتوویەتی: ئەم گوتەیەی خوای گەورە فریوتان نەدات کە دەفەرموێت: ﴿مَنْ جَاءَ

بِالْحَسَـنَةِ فَلَـهُ عَشْـرُ أَمْثَالِهَـا وَمَـنْ جَـاءَ بِالسَّـيِّئَةِ فَلَـا يُجْـزَى إِلَّـا مِثْلَهَا﴾(الانعام: ١٦٠)واتە: هەر كەسێك چاكەیەك بكات بە دە هێندە پاداشتی دەدرێتەوە، هەر كەسێكیش خراپەیەك بكات هەر تەنها بە یەك خراپە سزا دەدرێ..

دەڵێ: چونكە خراپە ئەگەر یەكێكیش بێت ئەوا (١٠) سیفەتی بەدی بەدوادا دێت:

یەكەم: ئەگەر بەندەیەك تاوانێكی كرد ئەوا خودا لێی تووڕە دەبێ و توانای سزادانیشی هەیە.

دووەم: بەو تاوانەی ئیبلیسی نەفرەتلێكراوی شادمان كردووە.

سێیەم: لە بەهەشت دوور كەوتۆتەوە.

چوارەم: لە ئاگری دۆزەخ نزیك بۆتەوە.

پێنجەم: خۆشەویستترین شت بە لایەوە كە خودی خۆیەتی، ئازار داوە.

شەشەم: خۆی كە پاكە، بەو تاوانە پیس و قێزەون كردووە.

حەوتەم: ئازاری ئەو فریشتانەی داوە كە پارێزگاری لێ دەكەن.

هەشتەم: پێغەمبەری ﷺ لە گۆڕدا ئازار داوە.

نۆیەم: ئاسمانەکان و زەوی و هەموو مەخلووقاتی لەسەر خۆی کردۆتە شایەت کەوا سەرپێچی کردووە.

دەیەم: ناپاکی لە هەموو بنیادەم کردووە و سەرپێچی پەروەردگاری جیهانیانی کردووە.

# بەشی سێیەم

## مەترسیی بەردەوامبوون لەسەر تاوان

ئەی ئەو کەسەی لەسەر تاوان بەردەوامیت، فەرمانەکانی خودات پشتگوێ خستووە، گوێڕایەڵی گومڕاییی شەیتانیت، تاکەی لەسەر تاوانەکانت بەردەوام دەبیت؟! لەو کردەوانە ڕادەکەیت کە لە خودا نزیکت دەخەنەوە؟!ئەوە لە دونیا دەخوازی کە دەستت پێی ناگات؟! ئەوەشت لە ئاخیرەت دەوێ کە نیتە؟! تۆ نە بە ڕۆژی خودا متمانەداریت، نە بەوەش دەگەیت کە فەرمانی پێ کردوویت.

**براکەم:**

سوێند بە خوا ئامۆژگاری سوودت پێ ناگەیەنێ، ڕووداوەکان ناتسڵەمێننەوە، نە زەمانە جڵەوت دەکات، نە مەرگ گوێت پێ دەدا، ئەی داماو وەك زیندوویەکی بێبایەخت لێ هاتووە..سوێند بە خوا ئەوانەی باری تاوانیان سووك بووە سەرکەوتوون، لەخواترسانیش لە سزای ئاگر سەلامەت دەرچوون، تۆش هێشتا هەر خەریکی گوناه و تاوانیت..

## دونیا تووڕدەن

**براکانم:**

هاوشـێوەی پیاوچـاکان کـە دونیایـان ڕەتکـردەوە و بـەلاوەنا ئێـوەش دونیـا تـووڕدەن، توێشـوو بـۆ گەشـتێك ئامـادە بکـەن کـە هەردەبێ بـبێ و لەبـەردەم هەمووانـە، پەنـد لـە ڕووداوەکـانی ڕۆژ و ساڵەکان وەرگرن.

جونەیـدی بەغـدادی دەڵـێ: (سـری السـقطي) نـەخۆش کـەوت و چوومە سەردانی و لێم پرسی: وەزعت چۆنە؟ گوتی:

کیف أشكو إلى طبيبي ما بي     والذي قد أصابني من طبيبي

چـۆن سـکاڵای ئـەو ئـازارەی هەمـە دەبەمـە لای پزیشـکەکەم، ئەوەی تووشم بووە لەو پزیشکەمەوەیە.

باوەشێنەکەم دەست دایە بـۆ ئـەوەی باوەشـێنی بکـەم، گـوتی: چۆن کەسێك کـە لەناخـەوە دەسـووتێ هەسـت بـە بـای باوەشـێن دەکات؟ ئەم شیعرەی گوت:

القلب محترق و الدمـــع مستبق     والكرب مجتمع و الصبر مفترق

كيف القرار على من لا قرار له     مما جناه الهوى و الشوق و القلق

يا رب إن كان شيء لي فيه فرج     فامنن علي بـــه مادام بي رمــق

دڵ گڕی گرتووە و فرمێسکیش جۆگەلەی بەستووە، خەمیش کۆبۆتەوە و ئارامیش نەماوە. چۆن ڕاکەین لە دەست بەری ئارەزوو و شەوق و نیگەرانی..خودایە ئەگەر شتێك ماوە مایەی خۆشی بێت تکایە پێم ببەخشە تا گیانم تێدا ماوە.

## شافیعی لە سەرەمەرگدا

لە (المزنی) دەگێڕنەوە، کە گوتوویەتی: لەو نەخۆشییەی تووشی ببوو و پێیەوە مرد سەردانی شافیعیم کرد، گوتم: چۆنیت؟ گوتی: دنیا جێدەهێڵم و لە برایان جودا دەبمەوە و شەڕابی مەرگ دەنۆشم و بە کارە خراپەکانم دەگەمەوە ودەچمەوە بەردەم خودا، جا نازانم ڕۆحم دەچێتە بەهەشت تا پیرۆزبایی لێ بکەم، یان دەچێتە دۆزەخ تا دڵنەوایی بکەم؟!پاشان گریا و ئەم شیعرەی گوت:

ولما قسا قلبي و ضاقب مذاهبي جعلت الرجا مني لعفوك سلما

تعاظمني ذنبي فلمـــا قرنتـــه بعفوك ربي كان عفوك أعظما

فمازلت ذا عفو عن الذنب لم تزل تجود و تعفو منة و تكرمـــا

فلولاك لم ينج من إبليس عـــابد وكيف وقد أغوى صفيك آدم

کاتێ دڵم ڕەق بوو و ڕێگاکانم لێ تەنگ بوونەوە، هیوا و ئومێدم بە لێخۆشبوونت کردە پەیژە، تاوانەکەم گەورە هاتە بەرچاو بەڵام کە بە لێبووردەیی تۆم بەراوردکرد بینیم لێبووردەیی تۆ

گەورەترە، تۆ هەمیشە لە تـاوان دەبـوری و بەخششـی لێخۆشـبوون دەبارێنی بەسەر بەندەکانت، ئەگەر تۆ نەبیت هیچ خواپەرسـتێك لـە فرتـوفێڵی ئیبلـیس ڕزگـاری نـابێ، ئـەی هـەر ئـەو نـەبوو ئـادەمی هەڵبژاردەتی هەڵخەڵەتاند..

## بگەڕێنەوە بۆ لای خودا

## براکانم:

لـەو تاوانانـەی کردووتانـە تەوبـە بکـەن و شـوێنپێی تەوبـەکاران هەلگرن، ڕێبازی ئەوانە بگرن کە گەڕاونەتەوە لای خودا، ئەوانەی لە پەشیمانبوونەوە و لێخۆشبوون بەهرەمەند بوون، بۆ ڕازیبوونی خودا خۆتان ماندوو بکەن، ئەگەر دەیانبینیت چۆن بە دەروونێکی ترسـاو و دڵێکـی داخورپـاوەوە لـە تاریکـاییی شـەواندا سـەرگەرمی نوێـژ و خواپەرستین، قورئانی پیرۆزی خودا دەخوێنن، نێوچەوانیان لەسـەر زەوی داناوە و پێویستییەکانیان بۆ ئەو خودایە بەرز کردۆتـەوە کـە دەبینێ و نابینرێ..

| | |
|---|---|
| ألا قف ببابي عند قرع النوائب | وثق بي تجدني خير خل و صاحب |
| و لا تبتغ غيري فتصبح نادما | و من يبتغ غيري يعش عيش خائن |

لە کاتی گرفتاربوونت وەرە لەبەر دەرگای من بوەستە، متمانەت پێم هەبێ دەبینی من باشترین دۆست و هاورێتم..جگە لە من کەسی تر هەڵمەبژێرە، چونکە دوایی پەشیمان دەبیتەوە، هەر کەسێك جگە لە من یەکێکی تر هەڵبژێرێ ئەوا وەکو ناپاك دەژی.

# بەشی چوارەم

## بێئاگایان ڕابن

ئەی بێئاگایان ڕابن، تاوانباران وازبێنن و پەند وەرگرن، توخوا پێم بڵێن کێ دۆخی باشترە؟ ئەوی ئارەزووەکەی کردوویەتییە بەندەی خۆی، یان ئەوەی بازرگانییەکەی دۆڕاندووە، یان ئەوەی ئاخیرەتی بە دونیا فرۆشتووە؟

ئەوە چ بێئاگایی و غەفڵەتێکە دڵی داگرتوون؟! ئەوە نابینن چۆن شمشێری مردن بەناوتان کەوتووە و یەك بە یەك پەلکێشی ئەودیوتان دەکات؟!هێشتا بە ئاواتی ئەوەن زیاتر بمێننەوە؟! نەخێر، سوێند بە خوا مردن بۆتان لە بۆسەدایە، کەس لە چنگی ڕزگاری نابێ، دە ئیتر هەستن خزمەتی خودای خۆتان بکەن و واز لە گوناه و تاوان بێنن بەڵکو دەست بە باڵتانەوە بگرێ.

## خاکگەرایی خوا پەرستان

لە موحەممەد کوڕی قودامەوە دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: ئەبو نەسر، بشری کوڕی ئەلحاریس تووشی پیاوێکی سەرخۆش بوو، سەرخۆشەکە دەستی کرد بە ماچکردنی ئەبونەسر و دەیگوت: ئەی گەورەم ئەبو نەسر، ئەبو نەسریش لێیگەڕا و لە خۆی دوور

نەخستەوە...کاتێ ڕۆیشت چاوەکانی ئەبو نەسر فرمێسکیان داباراند و گوتی: پیاوێك، پیاوێکی تری خۆشەویست تەنها لەبەر ئەوەی پێی وایە چاکەیەکی هەیە، ڕەنگە ئەو خۆشەویستە ڕزگاری ببێ بەڵام خۆشویستراوەکە نازانی حاڵی خۆی چۆنە؟!

پاشان چووە لای هەندێ خەڵك کە میوەیان دەخوارد و تەماشای دەکردن..پێم گوت: ئەی ئەبو نەسر ڕەنگە حەزت لە هەندێ لەو میوانە بێت؟ گوتی: نا، بەڵام تەماشای ئەم میوانە دەکەم و بیر لەوە دەکەمەوە خودایەك ئەو میوە بەتامانە بداتە کەسێك کە سەرپێچی دەکات ئەی ئاخۆ بۆ کەسێك دەبێ چۆن بێت کە گوێڕایەڵی دەکات، چی دەداتێ و چی دەرخوارد دەدات؟!

## لێپرسینەوە

قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يؤتى برجل يوم القيامة قد جمع المال من حلال وأنفقه في الحلال، فيقال له: قف للحساب، فيحاسب على كل حبة وذرة ودانق: من أين أخذه وفيما أنفقه) ثم قال صلى الله عليه وسلم: (يا ابن آدم، ما تصنع بالدنيا؟ حلالها حساب، وحرامها عقاب).

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ڕۆژی قیامەت پیاوێك دێنن ماڵ و دارایی بە ڕێگای حەڵاڵ کۆکردۆتەوە و لە حەڵاڵیشدا خەرجی کردووە، پێی دەگوترێ: بۆ لێپرسینەوە بوەستە، لەسەر هەموو ورد و درشت و دانقێك لێی دەپرسرێتەوە لە کوێی هێناوە و لە کوێ و چۆنی خەرج کردووە)..پاشان فەرمووی: (ئەی بنیادەم چی لە دونیایەك دەکەیت حەڵاڵەکەی لێپرسینەوەی لەسەرە و حەرامەکەشی سزای هەیە؟!)..

## لە سەرەمەرگدا

ولما حضرت جابر بن زيد الوفاة قيل: ما تشتهي؟ قال: نظرة في وجه الحسن فبلغ ذلك الحسن، فجاء ودخل عليه، وقال له: يا جابر كيف تجدك؟ قال: أجد أمر الله غير مردود. يا أبا سعيد، حدثني حديثا سمعته من رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فقال الحسن: يا جابر قال رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "المؤمن من الله على سبيل خير، إن تاب قبله، وان استقال أقاله، وان اعتذر إليه قبل اعتذاره، وعلامة قبل ذلك خروج روحه يجد بردا على قلبه". فقال جابر: الله أكبر! إني لأجد بردا على قلبي. ثم قال: اللهم إن نفسي تطمع في ثوابك، فحقق ظني، وآمن خوفي وجزعي، ثم تشهّد ومات رضي الله عنه.

کاتێ جابیری کوڕی زەیدی تابیعی لە گیانەڵادا بوو پێی گوترا: ئارەزووی چی دەکەیت؟ گوتی: دەمەوێ ڕووی حەسەن بەسری ببینم..ئەمە گەیشتەوە حەسەن و ئەویش هاتە لای و پێی گوت: جابر وەزعت چۆنە؟ گوتی: چۆن بم، فەرمانی خودا هاتووە و گەڕانەوەی بۆ نییە، دە فەرموودەیەکم بۆ بڵێ کە لە پێغەمبەرت ﷺ بیستبێ...حەسەنی بەسری گوتی: جابر، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ئیماندار لە لایەن خوداوە لەسەر ڕێگای خێر دانراوە، ئەگەر تەوبەی کرد لێی قەبووڵ دەکات، ئەگەر داوای لێبووردنی کرد لێی دەبووری، ئەگەر عوزری بۆ هێنایەوە عوزرەکەی لێ قەبووڵ دەکات، نیشانەی ئەوەش ئەوەیە کە بەر لە دەرچوونی گیانی هەست بە فێنکاییەک لەسەر دڵی دەکات)..جابر گوتی: الله أكبر من هەست بە فێنکاییەک لەسەر دڵم دەکەم..پاشان گوتی: خودایە دڵم چاوی لە پاداشتی تۆیە تکایە گومانەکەم بکە ڕاستی و لە ترس و نیگەرانی دڵنیامکە..پاشان شایەتمانی هێنا و مرد.

# بەشی پێنجەم

## پەڕاوی پەندەکان بخوێننەوە

**براکانم:**

جڵەوی نەفستان بکەن و دڵەکانتان لە گوناه بگێڕنەوە، بە زمانی هۆش و تێگەیشتن پەڕاوی پەند و وانەکان بخوێننەوە..ئەی ئەو کەسەی ئەجەل بەدواوەیەتی و هیوا و ئاوات لە پێشەوەیەتی، ئەی ئەو کەسەی باوەشت بە تاواندا کردووە..نووستووەکان بە ئاگا وەرنەوە، چەندان ساڵی تەمەنتان بەفیڕۆدا، دونیا هەمووی نووستنگەیە و چەندان خەونی خۆش و شیرینی تێدایە، بەڵام عەقڵی پیر تێیدا وەکو عەقڵی منداڵە، هەر کەس نەفسی خۆی شکاند ئەوا کەسێکی ئازا و بوێرە.

ئەم بێئاگاییە گەیشتە لوتکە و موسیبەتەکانیش نزیك بوونەوە..

**تەمەن**

ئەی ئەوەی تەمەنت دەڕوات و سنوورەکانت تێپەڕاندووە، بۆ موسیبەتەکەت بگری تۆ دەرکراویت، ئەی ئەو کەسەی تەمەنەکەی شایەتە لەسەری و ڕابردوو بۆی ناگەڕێتەوە، چەندان ئامۆژگاریت بیست و سپیبوونی مووەکانت پێیان گوتی کە مردن ڕووی لە تۆیە،

زمانی حاڵ پێت دەڵێ: ﴿يَا أَيُّهَا الْإِنْسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ﴾(الانشقاق: ٦)..ئەی مرۆڤ، تۆ لە دونیادا زۆر خۆت ماندوو دەکەیت و سەرەنجامیش هەر بۆ لای خودا دەگەڕێیتەوە..

**براکەم:**

ئێستا کاتی گەڕانەوە و داوای لێخۆشبوون و، وازهێنان لە گوناه و تاوانە، وتراوە: (هەر کەس تەمەنی گەیشتە چل ساڵ و چاکەی لە خراپەی زیاتر نەبوو با خۆی بۆ ئاگری دۆزەخ ئامادە بکات)..

## دونیا خانەی تاقیکردنەوەیە

خودای گەورە دەفەرموێ: (بەندەکانم، نەتانزانیوە من دونیام کردۆتە خانەی تەکلیف و تاقیکردنەوە، تەنها ئەوانە لای من پێگەی ڕێز و چاکەیان هەیە کە لە تاوان و گوناه گەڕاونەتەوە.. چیتانە بۆچی نەهاتوون بۆ بەر دەرگای من و ئارەزووی پاداشتی گەورە و فەزڵی من ناکەن و لە سزا و تووڕەبوونی من ناترسن؟!)

ئەی ئەو کەسەی بێئاگاییت گەورە بووە و بێهۆشی و مەستیت درێژەی کێشاوە، سەرنج بدە سۆز و بەزەیی و چاکەی خودا بەسەرتەوە، توخوا بە تەوبەکردن باری گوناه و تاوان لەسەر شانتان داگرن، بە دڵەوە ڕوویکەنە خودای گەورە، ڕووتان بە فرمێسکی چاوانتان بشۆن و بەرگی ملکەچی و سەرکزی بۆ خودا بپۆشن..

# بەشی شەشەم

## خۆتان بۆ ئاخیرەت ئامادەکەن

**براکانم:**

لەو غەفڵەت و بێئاگاییەی تێی کەوتوونە بەئاگا وەرنەوە، چونکە خەوی بێئاگایی زۆر قورسە، خۆتان بۆ ئاخیرەت ئامادەبکەن چونکە دونیا خانەیەکی کاتییە و لە ڕێگاشیدا کاتی سەرخەوێك هەیە.

لە هەندێ سەرچاوە هاتووە کە خوای گەورە سروشی بۆ هەندێ لە پێغەمبەرانی ناردووە کە فەرموویەتی: (ئەی پێغەمبەر، جیاوازیی زۆرە لە نێوان ئەوەی سەرپێچی و بێفەرمانیم دەکات لەگەڵ کەسێك، کە هەموو تەمەنی لە بەندایەتی و یادی مندا بەسەربردووە و هەمیشە لەبەر دەرگامدا بووە)

ئەی شەرمەزاری بۆ تاوانباران و پەشیمانی بۆ تەنبەڵ و بێ کردەوەکان..

## مایە پووچ کێیە؟

ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵەکانی گوت: (دەزانن کێ مایەپووچە؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، مایەپووچ لای ئێمە

کەسێکە نە درهەم نە دینارێکی نییە. فەرمووی: نا ئەوە نییە، بەڵکو مایەپووچ ئەو کەسەیە ڕۆژی قیامەت بە نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و سەدەقەوە دێت بەڵام جنێوی بەم داوە و شەقی لەم داوە و ماڵی ئەمی خواردووە و خوێنی ئەوی ڕشتووە، لە بەرانبەر ئەوەدا چاکەکانی دەدرێ بەو کەسانەی خراپەی دەرهەق کردوون تا بەر لەوەی مافی کەس نەمێنێ بەسەریەوە چاکەکانی تەواو دەبن، ئینجا تاوانەکانی ئەوانەی خراپەی بەرامبەر کردوون دەخرێتە ئەستۆی و پاشان فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە.)حدیث صحیح: رواه مسلم و أحمد و الترمذی و البیهقی.

## ئاگرین؟

ڕۆژێکیان حەسەنی بەسری دانیشت ئامۆژگاریی خەڵکی دەکرد، ئەوانیش دەورەیان لێدا بۆ ئەوەی لێی نزیک ببنەوە، ئەویش ڕووی تێکردن و گوتی: براکانم، ئێستا وا دەورەم لێ دەدەن و ئاپۆرام بە دەوریدا دەبەستن بۆ ئەوەی لێم نزیک بنەوە، ئەی دەبێ ڕۆژی قیامەت چۆن بن کاتێ مەجلیسی لەخواترسان نزیک دەخرێتەوە و مەجلیسی ستەمکاران دووردەخرێتەوە و بەوانەی باری تاوانیان سووکە دەگوترێ بپەڕنەوە و بەوانەشی باری تاوانیان قورسە دەگوترێ ڕاوەستن، خودایە دەبێ لەگەڵ بارگرانان ڕاوەستم، یان

لەگەڵ بارسووکان بپەڕمەوە؟ پاشان گریا تا بوورایەوە و ئەوانەی دەوروبەریشی هەموو گریان، پاشان هەڵسایەوە ڕووی تێ کردن و بانگی کردن: براکانم، ئایا لە ترسی ئاگر ناگرین؟ بزانن ئەوەی لە ترسی ئاگر بگریێ خودا لەو ڕۆژەدا ڕزگاری دەکات، کە خەڵك بە زنجیر و کۆت و پێوەندەوە ڕادەکێشرێن..

براکانم، لە تامەزرۆیی و تینوێتی بۆ خودا ناگرین؟! بزانن هەر کەسێك لە شەوق و پەرۆشی بۆ خودا بگری ڕۆژی دوایی لە سەیرکردنی خودا بێبەش ناکرێ..

براکانم، بۆ ئەو ڕۆژە ناگرین، کە هەموو خەڵك لە گۆڕەپانی مەحشەری قیامەت کۆدەکرێنەوە لە تێنوێتییان لێویان وشك هەڵگەڕاوە و جگە لە حەوزی پێغەمبەر ﷺ هیچ ئاوێکی تر نییە بیخۆنەوە، خەڵکێك دەیخۆنەوە و خەڵکێکی تر ڕێیان پێ نادرێ بیخۆنەوە، بزانن هەر کەس لە ترسی تینوێتیی ئەو ڕۆژەدا بگریێت خوای گەورە لە کانییەکانی فیردەوس تێراوی دەکات...واوەیلا بۆم ئەگەر لەو ڕۆژەدا تینوێتیم لەم حەوزەی پێغەمبەر ﷺ نەشکێنرێ..

پاشان گریا و گوتی: سوێند بە خوا ڕۆژێك بە لای ژنە خواپەرستێکدا تێپەڕیم و دەیگوت: خودایە لە شەوق و پەرۆشی و تاسەی تۆدا لە ژیان بێزار بووم..پێم گوت: ئافرەت پێتوایە لە

کردەوەکـەت لەسـەر یـەقینیت؟ گـوتی: خۆشەویسـتیی خـودا و پەرۆشیم بۆ دیداری ئەو داگیری کردووم، پێتوایە منێك کە ئەوم خۆشدەوێ سزام بدات؟

ئەو کاتەی من قسەم لەگەڵیدا دەکرد منـداڵێکی بچووکی هەنـدێ لە کەسوکارم بەوێدا تێپەڕی منیش هـەڵمگرت و لـە باوەشـم گـرت و ماچم کرد، پێی گوتم: ئەم منداڵەت خۆشدەوێ؟ گوتم: بەڵێ..گریا و گـوتی: ئەگـەر خـەڵك بیانزانیبـا سـبەی ڕووبـەڕووی چـی دەبنـەوە هەرگیز چاویان نەدەچووە خـەو و هـەرگیز دڵیـان بـە هـیچ شـتێکی دونیا خۆش نەدەبوو..

حەسەنی بەسری دەڵێ: لەو کاتەدا کوڕێکی ژنەکە هات کە نـاوی (ضـیغم) بـوو، ژنەکـە گـوتی: ضـیغم، پێـت وایـە ڕۆژی قیامـەت لـە مەحشـەردا لێـك جیادەکرێینـەوە؟ کوڕەکـە، کـە ئەمـەی بیسـت هـاوارێکی لێ هەسـتا وام گومـان بـرد دڵـی لـەت لـەت بـوو، پاشـان بووڕایەوە و کەوت، ژنەکەش دەستیکرد بە گریان لەسەری و منـیش لەبەر گریانی وی گریام، کاتێ کوڕەکـە هاتـەوە هـۆش، دایکـی پێـی گـوت: کوڕەکـەم مردنـت خۆشـدەوێ؟ گـوتی: بـەڵێ...دایك: بۆچـی کوڕەکەم؟ کوڕ: بـۆ ئـەوەی بچـمە لای یـەکێك کـە لـە تـۆ باشـترە و (أرحم الراحمين)ە، بۆ لای کەسـێك کـە لـە تاریکـاییی هـەناوی تـۆدا

خواردنی پێداوم و لە تەنگترین ڕێڕەودا منی دەرهێناوە، ئەگەر بیویستبایە لە کاتی دەرچوون لەو ڕێڕەوە تەنگە دەیمراندم و تۆش بە هۆی ئازاری زۆرەوە دەمردی، بەڵام بە سۆز و بەزەیی خۆی لەسەر من و تۆی ئاسان کرد، گوێت لێ نەبووە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ (٤٩) وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ الْعَذَابُ الْأَلِيمُ(٥٠)﴾(الحجر: ٤٩–٥٠) پاشان دەستی بە گریان کرد و هاواری دەکرد: ئەی هاوار ئەی هاوار ئەگەر سبەی لە سزای خودا ڕزگارم نەبێت! !ئیتر هەر دەگریا و دەگریا تا لە هۆش خۆی چوو و کەوت بە زەویدا، دایکی لێی نزیک بۆوە و دەستی لێدا دیتی مردووە..ئەویش دەستیکرد بە گریان و دەیگوت: ئەی (ضیغم)ەکەم، شەهیدی خودا.. ئیتر ئەویش هەر لەم دۆخەدا بوو، کە هاوارێکی گەورەی لێ هەستا و کەوتە سەر زەوی و مرد..

# بەشی حەوتەم

## سەرەنجامی نەزەر

**براکانم:**

دونیا ژەهرگەلێکی کوشندەیە، دڵەکانیش لە فێڵەکانی بێئاگان، چەندان سەیرکردن و نەزەر هەن، کە لە دونیادا خۆش و شیرینن، بەڵام تاڵاییەکەی لە دواڕۆژدا سەختە و بەرگەی ناگیرێ.

ئەی بنیادەم دڵت لاوازە و چاو بەرەڵاکردنت ترسناکە، چاوت بەرەڵاکراوە و زمانت تاوانان دەکات، جەستەت لە کۆکردنەوەی خاشاکی دونیادا ماندووە، چەندان سەیرکردنی سادە و بە هیچ دانەنراو خاوەنەکەی تووشی خلیسکان وماڵوێرانی کردووە.

عیسا پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) دەڵێ: (نەزەر، شەهوەت و ئارەزوو لە دڵدا دەچێنێ)

حەسەنی بەسری دەڵێ: (هەر کەس چاوی بەرەڵڵا کرد ئێش و ئازاری زۆر دەبێت)

لە ئیبن عەباسەوە گێڕدراوەتەوە کە گوتوویەتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و خوێنی لێ دەچۆڕا، پێغەمبەر ﷺ لێی پرسی: ئەوە چیت لێ قەوماوە؟ کابرا گوتی: ژنێك بە لامدا تێپەڕی منیش

تەماشام کرد، هەر چاوم لە دوای بوو تا ئەوەی خۆم بە دیوارێکدا کێشا، ئیتر ئەوهام لێ هات کە دەمبینی..پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خودا ئەگەر چاکەی بۆ بەندەیەکی ویست ئەوا هەر لە دونیا سزاکەی بۆ پێش دەخات.) رواه الامام أحمد و الطبراني.

# بەشی هەشتەم

## ئای لە بێ توێشوویی و دووریی ڕێگا!

### براکانم:

تا کەی و چەند لەسەر ئەو بێئاگاییە بەردەوام دەبن؟! ئاخر بێ مۆڵەتدان داوا دەکرێن و مردن دەگاتە سەرتان، بۆ خاتری خوا تکاتان لێ دەکەم توێشوو ئامادەکەن و ئەو کارانەی تێکتان داوە چاکیان بکەنەوە، وریای ئەجەل بن هاکا بووە میوانتان، وا دونیاش خۆی پێچاوەتەوە و شەیپوری بەڕێکەوتنی لێداوە، کەچی ئێوە هێشتا هەر خەریکی یاریی دونیان و لەبەردەمیشتاندا ڕۆژی حیساب و لێپرسینەوە هەیە!

ئای کە بارمان گرانە و ڕێگامان دوورە و کەم توێشووین!

### زەمکردنی لەخۆباییبوون

ئەی ئەو کەسەی بە ڕووتێکردنی دونیا لەخۆبایی بوویت، بە هیوای درۆیین هەڵخەڵەتاویت، ئەی بێکردەوە تا کەی تەوبەکردن دوا دەخەیت؟! خۆ تۆ لەو دواخستنە هیچ عوزرێکت نییە..تا کەی پێت بوترێ شێت و لەخۆبایی؟!

ئەی داماو، وا مانگەکانی چاکە و خێر بەسەرچوون و تۆ هێشتا خەریکی ژماردنی ڕۆژ و ساڵ و مانگی، بیر ناکەیتەوە تۆ لەلایەن خوداوە قەبووڵکراویت، یان تێهەڵدراو، پەیوەستیت یان پشتگوێخراو، سبەی زیندوویت یان بەرەو گۆڕت شۆڕ دەکەنەوە، خەڵکی دۆزەخیت یان بەهەشتیت؟! خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ﴾(غافر: ٧٨) واتە: لە ڕۆژی دواییدا، لەبەردەم خوای گەورە، ئا لەوێدا ئەوانەی لەسەر ناڕەوا و ڕێی ناڕاست بوون زەرەرمەند و قوڕبەسەر دەبن.

## فریشتەکانی مەرگ

لە هەندێ سەرچاوەدا هاتووە کە (کاتێ مرۆڤ دەکەوێتە گیانەڵاوە خودای مەزن پێنج فریشتەی بۆ دەنێرێ..

فریشتەی یەکەم ئەو کاتە دێت کە ڕۆحی گەیشتۆتە گەرووی و بانگی مرۆڤەکە دەکات: ئەی بنیادەم، کوا جەستە بەهێزەکەت؟! ئەمڕۆ چەند بێهێز بووە..کوا زمانە پاراو و ڕەوانەکەت؟! ئەمڕۆ چەند کپ و بێدەنگە..کوا کەسوکار و خزمەکانت؟! ئەمڕۆ چەند تەنیایت و دەورت چۆڵە..

كاتێ ڕۆحی دەكێشرێ و كفنی لەبەر دەكرێ فریشتەی دووەم دێتە لای و بانگی دەكات: ئەی بنیادەم، لە دونیا كە دەوڵەمەند بوویت چیت بۆ هەژاری و داماویی ئەمڕۆت ئامادەكردووە؟! لەو دونیا وێرانەیەوە هاتیت چیت ئامادەكردووە بۆ دونیای ئاوەدانی ئێرە؟! لێرە كە تەنیایت چیت ئامادەكردووە بۆ هاودەمیی ئەم تەنیاییەت؟!

كاتێ دەخرێتە سەر شان و بەرەو گۆڕستان دەبرێ، فریشتەی سێیەم دێتە كنی و بانگی دەكات: ئەی بنیادەم، ئەمڕۆ سەفەرێكی ئەوەندە دوور دەكەیت كە هەرگیز سەفەری لەمە دوورترت نەكردووە، ئەمڕۆ سەردانی خەڵكانێك دەكەیت كە پێشتر هەرگیز سەردانت نەكردوون، ئەمڕۆ دەچیتە نێو ڕاڕەوێكەوە كە هەرگیز نەچوویت بە ناو ڕاڕەوی لەم تەنگتر، خۆشی و شادی بۆت ئەگەر ڕەزامەندی خودات بەدەسهێنا، واوەیلا و هەشبەسەری بۆت ئەگەر كەوتییە بەر خەشم و قینی خودا!

كاتێ خرایە نێو گۆڕەوە، فریشتەی چوارەم دێت و بانگی دەكات: ئەی بنیادەم، دوێنێ تۆ لەسەر پشتی زەوی دەڕۆیشتی، بەڵام ئەمڕۆ وا لە ناو سكیدا ڕاكشاویت، دوێنی لەسەر پشتی زەوی قاقا پێدەكەنیت، بەڵام ئەمڕۆ لە هەناویدا هۆن هۆن دەگریت، دوێنێ

لەسەر پشتیدا گوناهکار بوویت، بەڵام ئەمڕۆ لەناو سکیدا پەشیمانیت.

کاتێ خۆڵی بەسەردا دەکەن و کەسوکار و دراوسێ و هاوڕێکانی دەڕۆن و بەجێی دێڵن، فریشتەی پێنجەم دێت و بانگی دەکات: ئەی بنیادەم، ئەوا لەژێر خاکیان نایت و بەجێیان هێشتیت، خۆ ئەگەر لە لاشت مابوونایەوە هەر سوودیان بۆت نەدەبوو، ماڵ و سامانت کۆکردەوە و بۆ کەسانی ترت بەجێهێشت، ئەمڕۆش چارەنووست یەکلا دەکرێتەوە، یان بۆ بەهەشتی بەرز یان بۆ ناو ئاگری گەرم).

# بەشی نۆیەم

## سەفەری دونیا و ئاخیرەت

براكانم: سەفەركردن لەم دونیایە لەسەر هەموومان نووسراوە، بۆمان نییە داوای مانەوە لە خانەی دونیایەك بكەین كە: ساڵەكانی تەنها میوانخانەن، مانگەكانی قۆناغگەلێكن، ڕۆژەكانی چەشنی میلن، هەناسەكانی هەنگاوگەلێكن، سەرپێچییەكانیش وەكو ڕێگر وان، قازانج بەهەشتە و دۆڕانیش ئاگر..لە ساتی دروستبوونمانەوە تا دوا قۆناغ، شەش سەفەرمان لەپێشە:

سەفەری یەكەم: سەفەری دروستبوونمان لە قوڕەوە.

سەفەری دووەم: لە پشتی پیاوەوە بۆ منداڵدانی ژن.

سەفەری سێیەم: لە منداڵدانەوە بۆ سەر زەوی.

سەفەری چوارەم: لە سەر زەوییەوە بۆ ناو گۆڕ.

سەفەری پێنجەم: لە گۆڕەوە بۆ ڕاگرتن لەبەردەم خوای گەورە(العرض).

سەفەری شەشەم: لە(العرض)ەوە بۆ خانەی مانەوە" جا یان بەهەشتە یان دۆزەخ..

ئێستا ئێمە نیوەی ڕێگاکەمان بڕیوە و هێشتا سەختترەکەیمان ماوە، کە سێ سەفەرەکەی دواییە.

## وریای دونیابە

ئەی ئەوەی بە کۆڵێك خەمەوە بەیانی دەکاتەوە و داد و بێدادیەتی: خۆت تەسلیمی خوا بکە و کارت بدە دەست ئەو ئیسراحەت دەکەیت، بەردەوام داد و فیغان و شین و شەپۆڕتە و ئەوەت لەبیرچووە، کە چەند کاری بەد و خراپت کردووە؟! ئەگەر لە دڵەوە و بە دەروونێکی خاوێنەوە بگەڕێیتەوە لای خودا ئەو خەم و پەژارەکەت بەزوویی لەسەر لادەبات..

براکەم: وریای دونیابە، چونکە نەفامیی دونیا یەکلابۆتەوە، بە کەم شتێك قەناعەت بکە و بزانە کە مردن دوا چارەنووسی تۆیە.

## غولامێکی لەخواترس

عبدوڵڵای کوڕی مبارك دەڵێ: چوومە شاری مەککە بینیم خەڵك تووشی بێبارانی و قاتوقڕی بوونە و لە مزگەوتی حەرام داوای بارانبارین لە خوای گەورە دەکەن، غولامێکم بینی هاتە ئەوێ، جلکێکی سادە و هەژارانەی لەبەردا بوو، هاتە شوێنێکی پەنهانی تەنیشت من و دەستیکرد بە پاڕانەوە لە خوا و دەیگوت: خودایە،

دەموچاوەکان بە هۆی زۆریی تاوان و گوناهەوە داڕزاون و تۆش بۆ تەمبێکردنی خەڵك بارانت لێ بەند کردووین، ئەی (حلیم)، ئەی ئەو کەسەی هەر جوانییت لێ دەوەشێتەوە، هەر ئێستا بارانیان بۆ ببارێنە و تێراویان بکە..

ئینولموبارەك دەڵێ: ئەم غولامە هەر دەیگوت و دەیگوتەوە: بارانیان بۆ ببارێنە بارانیان بۆ ببارێنە..تا ئەوە بوو هەورەکان کۆبوونەوە و دایکردە باران، بەڵام چ بارانێك؟! دەتگوت: دەمی کوندە کراوەتەوە وەها بەخوڕ دەباری! غولامەکەش لە شوێنی خۆی دانیشتبوو تەسبیحاتی خودای دەکرد..منیش دەستم کرد بە گریان، کە ڕۆیشت شوێنی کەوتم تا شوێن و ناونیشانی ماڵەکەیم زانی...چوومە لای فوزەیلی کوڕی عیاز و چیرۆکی غولامەکەیم بۆ گێڕایەوە، هاواری کرد و کەوت بە زەویدا و گوتی: هاوار بۆ تۆ ابن المبارك بمبە بۆ لای..گوتم: ئێستا کات درەنگە و بەیانی بەدوایدا دەگەڕێم..

بۆ ڕۆژی دواتر نوێژی بەیانیم کرد و چوومە شوێنەکە، دیتم پیرەپیاوێك لەبەر دەرگا دانیشتووە، کاتێ منی بینی ناسیمیەوە و گوتی: ئەبو عەبدوڕەحمان بەخێربێیت، فەرموو با خزمەتت بکەین چ پێویستییەکت هەیە؟ گوتم: پێویستم بە غولامێکە..

گوتی: بەڵێ هەمە، بە ئارەزووی خۆت یەكێك هەڵبـژێرە، بـانگی كردن: غـولامێكی بـەهێز هاتـەدەرێ، گـوتی: ئـەوە زۆر بەتوانایـە و دڵنیـام بـەدڵت دەبـێ و لێـی ڕازی دەبیـت، گـوتم: ئـەوەم پێویسـت نییە..ئیتر یەك بە یەك دەری دەهێنان تا گەیشتە ئەو غولامـەی مـن گەرەكم بوو، كاتێ بینیم فرمێسك بە چـاومدا هاتـە خـوارێ و گـوتم: ئەمەم دەوێ..گوتی: ئەمە نافرۆشم..گوتم: بۆ؟ گوتی: ئەمە پیـت و بەرەكەتی بۆ ماڵەكەم هێناوە، لەوەتـەی ئـەو هـاتووە تووشـی هـیچ موسـیبەت و ناخۆشـییەك نەبوومەتـەوە..گوتم: خـواردنی لـەكوێوە دەست دەكەوێ؟ گوتی: پەت و پڵێـت دەچـنێ و ڕۆژانـە نیو(دانـق) كەمتر یان زیاتر ی دەست دەكەوێ(دانق فیئەی پارەیەكی كۆنە كـە دەكاتە شەشیەكی درهەمێك)، خـواردنی لەمـەوە دەسـت دەكـەوێ، ئەگەر فرۆشتی باشە ئەگەرنا ئارام دەگرێ...غولامـەكانی تـر پێیـان گوتم كە لەم شەوە درێژەدا ناخەوێ و تێكەڵی كەسیش نـابێ، هـەر خەریكی خۆی دەبێ..بەڕاستی دڵم پێـوەی نووسـا و گـوتم بـە هـەر جۆرێك بێت دەبێ لێی بسەنم..گوتم: وا دەچمە لای فـوزەیلی كـوڕی عیاز و سوفیانی سەوری..پاشان دیسان گەڕامەوە لای و سـووربووم لەسەر داواكردنی غولامەكە تا پیرەپیاوم ڕازی كرد، گوتی: دە بیبـە هیترم زۆرن...ئـیتر لـێم كـڕی و بـەرەو مـاڵی فـوزەیلم بـرد، كـەمێك

ڕۆیشتم گوتی: ئاغاکەم چیت دەوێ؟ گوتم: پێویستت بە چییە؟ گوتی: من جەستەیەکی لاوازم هەیە و توانای خزمەتکردنم نییە و هیتری لە من باشتر و بەهێزتر هەبوو ئەوانت هەڵبژاردبان، گوتم: من تۆم بۆ خزمەتکردن نەکڕیوە، بۆ ئەوەم کڕیویت وەکو کوڕی خۆم ڕەفتارت لەگەڵدا بکەم و ژنت بۆ بێنم و خۆم خزمەتت بکەم..گریا، پێم گوت: بۆ دەگریت؟ گوتی: تۆ ئەمە ناکەیت تەنها لەبەرئەوە نەبێ کە هەندێ شتی پەیوەست بە خوداوەت لە من بینیوە ئەگەرنا بۆ لەنێو ئەو هەموو غولامە منت هەڵبژارد؟ گوتم: من بۆ ئەمە پێویستم بە تۆ نییە..گوتی: توخوا پێم بڵێ..گوتم: بە هۆی گیرابوونی دوعا و پاڕانەوەکانت بەدوای تۆدا گەڕام..گوتی: من بە پیاوێکی باشت دەزانم، خودا خەڵکێکی باشی هەیە کە تەنها بۆ خۆشەویستانی خۆی ئاشکرایان دەکات و دەیانناسێنێ..

پاشان گوتی: دەتوانی کەمێك چاوەڕێم بکەیت چونکە هەندێ نوێژی دوێنێم ماوە بیانکەم؟ گوتم: ماڵی فوزەیل نزیکە دەچین لەوێ بیانکە..گوتی: نا ئێرەم پێ خۆشترە، فەرمانی خودا نابێ دوابخرێ..ئیتر چووە مزگەوتەوە و هەر سەرگەرمی نوێژکردن بوو تا ئەوەی دەیویست بۆی هات، ئاوڕێکی دایەوە و گوتی: ئەبو عبدوڕحمان هیچ پێویستییەکت لە من داوایە؟ گوتم: بۆ؟ گوتی:

چـــونكه مـــن دەمـــــەوێ بڕۆم..گـــوتم: بـــۆ كـــوێ؟ گـــوتی: بـــۆ ئاخیرەت..گوتم: تكایە وا مەكە با سوودت لێ وەرگرم..گوتی: تا ئەو كاتە ژیان شیرین و خۆش بوو كـە مامەڵەكـە تـەنها لـەنێوان خـۆم و خودا بوو، كە تۆ پێت زانـی بێگومـان خـەڵكی تـریش پێـی دەزانـن، منیش پێویستم بەوە نییە خەڵك پـێم بـزانن..ئیتر دوای ئـەم قسـانە چووە سوژدە و لە خوا دەپاڕایەوە و دەیگوت: خودایـە هـەر ئێسـتا ڕۆحم بكێشە و بمبەوە لای خۆت...كاتێ لێـی نزیـك بوومـەوە بینـیم كۆچی دوایی كردبوو..سوێند بە خـوا هـەر كـاتێ بـیرم دەكەوێتـەوە خەم دامدەگرێ و دونیام لەبەرچاو بچووك دەبێتەوە..

# بەشی دەیەم

## تا کەی بێئاگایی؟

ئەی ئەو کەسەی بەرگی خواپەرست و دونیانەویستانت بە ڕواڵەت پۆشیوە و دڵیشت بێئاگایە، بە ڕووکەش خواناسیت و لە ناخیشدا وێران و بۆگەنیت، خۆشەویستی لە کەسێك ناوەشێتەوە کە دڵی بە دونیاوەیە، ئەگەر ڕەنجکێشان و جیهادی نەفس نەبێ مرۆڤ نابێ بە پیاو، ئەی دڵمردوو بەڵێنەکەت لە دونیا دروستە بەڵام لە ئاخیرەت مەحاڵە، ئەگەر لە سەردەمی لاوێتیدا دەسپێشخەری ناکەیت ئەوا لە جوامێریدا هەنگاو بنێ و ڕوو لە خوا بکە، دوای موو سپیبوون زەحمەتە چاوپۆشین لە گوناهی کەسی پیر، سەردەمی گەنجێتیت لە غەفڵەتدا بەسەربرد و لە سەردەمی پیریشدا بۆ ئەوە دەگریت کە کەمتەرخەم بوویت، ئەگەر بزانیت چەند تاوانت لەسەر نووسراوە ئەوا بەدرێژایی شەوان فرمێسکانت دەباراند.

پیاوێك بە زەننونی گوت: هەر کات لەبەر دەرگایەك لە دەرگاکانی خودای گەورە دەوەستم کێشە و گرفتێکم تووش دەبێ کە دوورم دەخاتەوە لە خودا، چی بکەم و چارەم چییە؟

پێی گوت: براکەم، لەبەر دەرگای خوداکەت چەشنی منداڵێکی بچووك بە لەگەڵ دایکی، هەر کات دایکی لێی بدات زیاتر خۆی پێدا هەڵدەواسێت و هەر چەند لە خۆی دووربخاتەوە ئەو پتر خۆی لێ نزیك دەخاتەوە تا ئەوەی دایکی لە ئامێزی دەگرێت.

## هاوڕێی تۆبەکاران بە

ئەی بێئاگا، تا کەی گوێبیستی هەواڵ و بەسەرهاتی پیاوچاکان دەبیت و شوێنپێیان هەڵناگریت؟! ببە هاوڕێی تۆبەکاران بەڵکو بە هۆی ئەوانەوە ڕێی ڕاست دەدۆزیەوە، بۆ حاڵی دووریت لە خودا بگری، چەشنی تۆ دەبێ زۆر بگری، داوای لێبووردن لە خودا بکە بەڵکو بە خۆزەلیلکردن بۆ خودا شادمان بیت و خەم و پەژارەت لە دڵدا نەمێنێ..

زۆر سەیرە، چەندە سەرزەنشتت دەکەین بەڵام بۆ تۆ هیچ سوودێکی نییە، چەندە هاوارت لێ دەکەم و قسە لەگەڵ دڵت دەکەم بەڵام نابیستی و گوێ ناگریت، یەکێك لە نیشانەکانی ڕوو لێ وەرگێڕانی خودا لە بەندە ئەوەیە کە دڵێکی مردووی هەیە، هەر بە دوای خۆشەویستیی دونیا و کۆکردنەوەی حەرامەوەیە، بزانە ئەی بێئاگا لە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان و بەجێهێشتنی بۆ کەسێکی بێکەڵك لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکرێ..ئەو کاتەی تۆ لە باخی گەمە

و یاریت هەر ئەوەندە دەزانی دەگوترێ فلان کەس ڕۆیشت و ئومێدی گەڕانەوەی نییە..

## چیرۆکی خواپەرستێك

عەلیی کوڕی ئەبو سالح دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە چیای (لکام) بە دوای زاهید و خواپەرستاندا دەگەڕام، پیاوێکم بینی جلکێکی پینەکراوی لەبەردا بوو، لەسەر گاشەبەردێك دانیشتبوو و سەیری زەوی دەکرد، لێم پرسی: یا شێخ ئەوە لێرە چی دەکەی؟ گوتی: تەماشا دەکەم و چاودێری دەکەم..گوتم: تەنها هەر بەرد لەبەردەمت دەبینم، تەماشا و چاودێری چی دەکەیت؟ گوتی: تەماشای خورپە و چرپەکانی دڵم دەکەم و چاودێری فەرمانەکانی پەروەردگارم دەکەم، بۆ خاتری خودا ئەگەر وازم لێ نەهێنی، بەڕاستی لە خواکەمت دابڕاندم و مەشغولت کردم..گوتم: شتێکم پێ بڵێ سوودم پێ بگەیەنێت..گوتی: هەر کەس بەر دەرگا بگرێ لە خزمەتدا دڵسۆزتر و دامەزراوترە، هەر کەس زۆر یادی تاوانەکانی بکاتەوە زۆر پەشیمانی دەردەبڕێ، هەر کەسیش پشت بە خوا ببەستێ و بە هۆی ئەوەوە بێ نیاز ببێ ئەوا لە هەژاری و نەبوونی ناترسێ...

پاشان بەجێی هێشتم و ڕۆیشت..

# بەشی یازدە

## خێراکردن بەرەو دونیا

ئەی ئەوەی هەردەم بە دوای دونیا بەخێرایی ڕاکە ڕاکەتە، ئەگەر بۆ بەدەستهێنانی ئاخیرەت هێواش هێواش بڕۆیت ئەوا چ سوودێکی هەیە؟! سەیرە! ئەم دونیایە ئەو هەموو کۆسپ و تەگەرەیەی تێدایە، کەچی تۆ هەر بۆی غاردەدەیت!..

بزانە، تەمەن ئەمانەتە کەچی تۆ لاوێتیت لە ناپاکیدا و جوامێریت لە تەنبەڵی و بێکاریدا فەوتاندووە، ئینجا لە پیریشدا دەست دەکەیت بە نوزەنوز و گریان و دەڵێیت: ئای تەمەنم بەفیڕۆ چوو..ئاخر تۆ ئەوەندە ناپاکیت بۆ دونیا ساغ و سەلیمیت و بۆ ئاخیرەتیش نەخۆش و دەردەداریت! لە ڕێگای خواناسیدا شەلیت و بێ هیممەتیت..

ئەی ئەو کەسەی لە ژێری ژێرەوەیت، تەمەنت لە شەوی غەفڵەتدا بەسەربرد و هاکا زانیت پیری یەخەی گرتیت، بەسە ئیتر وازبێنە و بەر لەوەی لە دونیا دابڕێیت لەگەڵ تۆبەکاران بکەوە و ڕێی خودا بگرە: ﴿وَمَا مِنْ غَائِبَةٍ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾(النمل: ٧٥) واتە: هیچ شتێك نە لە ئاسمان و نە لە زەوی لە

خودا ون نابێ، ئەگەر شتێك لای ئێوە بزر بێت و دیار نەبێت ئەوا بە پێچەوانەوە هەموو شتێك لای خودا ئاشکرایە و لە کتێبێکی ڕووندا تۆمارکراوە.

## ژنێکی خواپەرست

زوننونی میسری دەڵێ: ژنێکی خواپەرستم بینی، کاتێ لێی نزیك بوومەوە و لێم نزیك بۆوە سڵاوی لێکردم و منیش وەڵامم دایەوە، پێی گوتم: لەکوێوە هاتوویت؟ گوتم: لە کن دانایەك کە وێنەی نییە..هاوارێکی توندی کرد و پاشان گوتی: هاوار بۆ تۆ، چۆن لەگەڵ ئەودا هەستت بە تەنیاییی غەریبی کرد تا بەجێت هێشت؟! ئاخر ئەو هاودەمی غەریبان و پاڵپشتی لاوازان و گەورەی گەورانە! یان چۆن دڵت ڕێی پێدایت لێی جیابیتەوە؟ بەم قسانەی گریاندمی..گوتی: بۆچی دەگری؟ پێم گوت: دەستت خستە سەر برینەکەم دەی زوو چارەسەری بکە..گوتی: ئەگەر ڕاستگۆ بوویت بۆچی گریایت؟ گوتم: بۆ ڕاستگۆ ناگرییێت؟ گوتی: نا...گوتم: بۆچی؟ گوتی: چونکە گریان ڕاحەتە بۆ دڵ و ئەوەش کەموکورییە لای هۆشمەندان..پێم گوت: شتێکم پێ بڵێ خودا سوودم پێی بگەیەنێ..گوتی: لە شەوقی دیداریدا، خزمەتی خواکەت بکە چونکە ڕۆژێکی هەیە تێیدا بۆ دۆستەکانی دەردەکەوێ، چونکە خودای

گەورە لە دونیا جامێکی لە خۆشەویستیی خۆی پێداون، کە هەرگیز تینوو نابن..پاشان دەستی بە گریان کرد و دەیگوت: خوداکەم، گەورەکەم، تا چەند و تا کەی لە خانەیەکدا بەجێم دێڵی کە تێیدا هاودەمێکم دەست ناکەوێ لەسەر بەڵایەکەم هاوکاریم بکات؟!

**براکەم:**

ئەگەر خودا لەبەر دەرگاکەی دەریکردیت بۆ لای دەرگای کێ دەچیت؟!بۆ چ ڕێگایەك دەڕۆیت؟ ڕوو لە چ لایەك دەکەیت؟ خۆت بە دەرگای خودا هەڵواسە، بەڵکو گەڕانەوەکەت بەرهەمی هەبێت و بە چاوی بەزەیی بۆت بڕوانێ..

**نوری خودایی**

ڕۆژێکیان (عیسای کوڕی مەریەم) چووە لای حەوارییەکان، بینی تەپوتۆزاوین و ڕووخساریشیان نوری لێ دەبارێ، گوتی: ئەی کوڕانی ئاخیرەت، بە هۆی نیعمەتی ئێوەوەیە خەڵك لە خۆشیدا دەژیت..

پرسیار لە حەسەنی بەسری کرا: ئەوە بۆچی ئەو کەسانەی شەوبێداری دەکەن لە هەموو کەسێك ڕوویان جوانترە؟ گوتی: لەگەڵ خودای خۆیان خەڵوەتکێشیان کردووە، ئەویش نوری خۆی کردۆتە بەریان.

ئبوو ماجید دەگێڕێتەوە و دەڵێ: من سۆفییەکانم خۆشدەویست، ڕۆژێکیان چوومە مەجلیسیانەوە، کەسێکم لەوێ بینی هەر حەزت دەکرد تەماشای بکەیت، هەر کاتێك گوێی لە مامۆستا و قورئانخوێنەکە دەبوو یەکسەر دەگریا و دەیگوت: الله الله و فرمێسك لە چاوی وشك نەدەبوو..منیش سەیرم پێ هات لەم تەمەنی لاوییەدا ئەو هەموو گریان و فرمێسك باراندن و ئاهونزولەیە!لە هەندێ سۆفیم پرسین، گوتیان: ئەوە تۆبەکارە و بەردەوام فرمێسك دەبارێنێ و زۆر نوێژ دەکات، دڵنەرم و بەسۆزە..لەم قسانەدا بووین قورئانخوێن ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ﴾(البقرة: ١٥٢)..یەکسەر هەستایە سەر پێ و دەیگوت: ئەی خوای گەورەم، داماو و بێهوایە ئەو کەسەی جگە لە زیکری تۆ شتێکی تری لە دڵدایە، جا لە بوونەوەردا جگە لە تۆ کەس و شتێکی تر هەیە تا یاد و زیکری بکرێ ئەی خۆشەویستیی دڵان؟!

## جۆرەکانی پیاو

ئەبو عەلی گوتوویەتی: پیاوان لە پلەوپایەدا چوار جۆرن:

یەکەم: پیاوێك خۆشەویستی و گەورەیی خودا دڵی داگیرکردووە، بۆیە تەنها هەر ئەوی لە یادە و دونیا و ئەوەی تێیدایە بێئاگایان نەکردووە، خوای گەورە ئەم جۆرە پیاوانەی وەها وەسف

کردووە: ﴿رِجَالٌ لَا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ﴾(النور: ٣٧)..واتە: پیاوانێك هەن، کە بازرگانی و کڕین و فرۆشتن لە یادی خودا بێئاگایان ناکات..

دووەم: پیاوێك پەیمان و بەڵێنی بە خوا داوە کە ڕاستگۆیانە بەدەم بانگەوازەکەیەوە بچێت و بەندایەتیی ڕاستەقینەی بۆ بکات و دڵسۆزیی تەواوی بۆ ڕابگەیەنێ، ئەمانەش خودا لە قورئاندا بەم شێوەیە وەسفی کردوون: ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ﴾(الاحزاب: ٢٣) واتە: پیاوانێك هەن ئەو پەیمانەی بە خودایان دا بە ڕاستگۆییەوە بردیانەسەر.

سێیەم: پیاوێك هەموو بوون و شتێکی لەپێناو خودایە، لەپێناو خودا قسە دەکات و فەرمان دەکات بە چاکە و ڕێگری دەکات لە خراپە، خودا بەم جۆرە وەسفی کردووە: ﴿وَجَاءَ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَى﴾(یس: ٢٠) واتە: لەو سەری شارەوە پیاوێك بەخێرایی هات.

چوارەم: پیاوێك ڕاز و نهێنییەکانی لە خۆی و فریشتەکان دەشارێتەوە و کەس ئاگای لە ڕاز و نیازی ناو دڵی نابێ تەنها خوداکەی نەبێت، ئەمەش خودا بەم جۆرە وەسفی کردووە: ﴿اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُتَشَابِهًا مَثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ

يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ﴾(الزمر: ٢٣)..واتە: خوا (جل جلالە) جوانترین و پیرۆزترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە کە ئەم قورئانەیە، (لە جوانی دارشتندا) بابەتەکانی لە یەك دەچن، هەندێك باسیشی بەشێوازی جیاواز تیادا دووبارە بۆتەوە، جا کارکردی ئەم قورئانە ئەوەیە کە: تەزوو دەهێنێت بە گیان و پێستی ئەو کەسانەدا کە ترسی پەروەردگاریان لە دڵ و دەروندا هەیە، پاشان گیان و پێست و دڵیان نەرم و ئامادە و چالاك دەبێت بۆ یادی خوا و خواپەرستی.

## کۆششی خۆشەویستان

موغیرەی کوڕی حەبیب دەڵێ: گوێبیستی کۆششی دۆستانی خودا و لاڵانەوەی خواناسان ببووم، حەزم دەکرد بە چاوی خۆم شتێکی وا ببینم، بۆیە ڕووم کردە لای مالکی کوڕی دینار، چەند شەوێك بەنهێنی و بێ ئەوەی ئەو پێ بزانێ چاودێریم دەکرد، دوای نوێژی عیشا دەسنوێژەکی دەگرت و دەستی بە نوێژان دەکرد، جاری وا هەبوو هەموو شەوەکەی بە دووبارەکردنەوەی ئایەتێك، یان دوو ئایەت بەسەردەبرد، جاری واش هەبوو قورئانێکی زۆری دەخوێند، کاتێ کڕنووشی دەبرد و کاتی سەلامدانەوە لە نوێژ

دەهات ڕیشەکەی دەگرت و دەیگوشی فرمێسکی لێ دەچۆڕایەوە، دواتر بە ئاهونزولەوە دەیگوت:

ئەی خوداکەم، ئەی ئەو کەسەی ئەستۆی منت بە دەستە و گوێبیستی ناڵە و چرپەم دەبیت، پێشتر فەرمووتە: ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾(المائدة: ٥٤) خۆشەویست دۆستی خۆی سزا نادات، لێت دەپاڕێمەوە مووی سپی مالیك لە ئاگر قەدەغە بکە، ئەی خودایە، تۆ دەزانی کێ ئەهلی بەهەشتە و کێ ئەهلی دۆزەخ، دەشزانیت مالیك ئەهلی کامیانە و کوێ ماڵی ئەوە...ئیتر بەم شێوەیە تا بەرەبەیان دەپاڕایەوە و دەکروزایەوە تا بە دەسنوێژی عیشا نوێژی بەیانی دەکرد.

# بەشی دوازدە

## ئیتر بەسە ئەی داماو

ئــەی دامــاو، وا دەبیــنم خــودا ڕووی لێ وەرگێــڕاوی، ئــەو مووسپیبوونەت ئاگادارکردنەوەیە بۆ بارگە پێچانەوەت، ئیتر خۆت ئامادەکە، تاکەی بیانوو، تاکەی تەنبەڵی، تاکەی بێئاگایی؟! وا نازانم ڕۆژی لێپرسینەوە بیانووت هەبێ، هێڵی پەیوەندیت لەگەڵ پــەروەردگار پچــڕاوە، مــاڵی دابڕانیشــت ئاوەدانــە، هەســتە دەسپێشخەری بکە بەڵکو بە تۆبەکردن قەرەبووی بکەیتەوە، تەنها کڕنووشێك تا بەیانی درێژەی پێ بدە بەڵکو لە ئاگر ڕزگارت ببێت: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَالُهُمْ بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ﴾(الرعد: ١٥) واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، لەسەر ڕەزامەندیی خۆیان بێ، یان بە ناچاریی سوژدە بۆ خوای بەدیهێنەر دەبەن هاوڕێ لەگەڵ سێبەرەکانیاندا لە بەرەبەیان و دەمەو ئێواراندا.

## حاڵی ئەوانەی یادی خوا دەکەن

خۆشبەختی بۆ ئەو کەسانە کە بە یادی خودا دڵیان ئاوەدانە، جگە لە خودا هیچ شتێکی تر لە دڵیاندا نییە، ئەگەر دوان یادی ئەو

دەکەن، ئەگەر جوولانەوە بە فەرمانی وییە، ئەگەر دڵخۆش بوون بەهۆی نزیکبوونەوەیە لەو، ئەگەر خەمباریش بوون بە هۆی گلەیی ئەمەوەیە..خۆراکیان یاد و زیکری خودای خۆشەویستە، کاتەکانیان بە لاڵانەوە و چپەدوو لەگەڵ ئەودا شیرینە، ساتێك بێ ئەو ئارام ناگرن، تاکە وشەیەکیش بە بێ ڕەزامەندیی ئەو گۆ ناکەن.

## تاقیکردنەوەی زانایەکی بەغدایی

لە هەندێ سەرچاوەدا هاتووە: پیاوێك کە لە زانا و فەقیهانی بەغدا بووە و لە بواری زانست و چاکیدا بەناوبانگ و، شێخێکی گەورە و بەڕێز بووە، بە نیاز بووە سەفەری حەج و سەردانی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بکات، لەگەڵ چەند قوتابی و هاوڕێیەکی بەرەو شوێنی مەبەست بەڕێ کەوتوون..لە ڕێگادا ماندوو دەبن و تووشی (دێر)ێکی مەسیحییەکان دەبن، هاوڕێ و قوتابییەکانی دەڵێن: مامۆستا دەچینە بەر سێبەری ئەو دێرە پشوویەك دەدەین تا دونیا تۆزێك فێنك دەبێ ئەوجا بەڕێ دەکەوینەوە..ئەویش دەڵێ: چۆنتان پێ خۆشە وا بکەن..قوتابییەکان دەچنە بەر سێبەری دێرەکە و لە ماندوێتییان خەویان لێدەکەوێت...مامۆستاکەیان نانوێت..شێخ لە دەوروبەری دێرەکە بەدوای ئاو بۆ دەسنوێژ دەگەڕێ، لەپڕ چاوی دەکەوێت بە کچێکی بچووکی جوانی چەشنی خۆر، تیری جوانیی

کچەکە دەدا لە دڵی شێخ و هەموو شتێکی لەبیردەباتەوە، دەمودەست ڕوو دەکاتە دەرگای دێرەکە و بەتوندی لێی دەدا، ڕەبەن (ڕاهیب)ێك دێتە دەرەوە و پێی دەڵێ: تۆ کێیت؟..ئەویش خۆی دەناسێنێ کە زانا و شێخێکی موسڵمانانە و خەڵکی بەغدایە..ڕاهیبەکە دەڵێ: چیت دەوێ ئەی زانای موسڵمانان؟ شێخ دەڵێ: ئەو کچەی تازە لە سەربان دەرکەوت چی تۆیە؟ ڕاهیب: کچمە، بۆ دەپرسی؟ شێخ: دەمەوێ لێم مارە بکەیت؟ ڕاهیب: لە ئایینی ئێمەوە ئەوە ڕێپێدراو نییە، ئەگەر ڕێپێدراو بووایە بە بێ پرسی ئەو یەکسەر لێم مارە دەکردی، پەیمانم بە خۆم داوە کەسێك پێی ڕازی نەبێ لێی مارە نەکەم..بەڵام ئێستا دەچم پێی دەڵێم ئەگەر پێت ڕازی بوو لێت مارە دەکەم..شێخ: زۆر باشە..

ڕەبەنەکە دەچێتە لای و بابەتەکەی تێدەگەیەنێ..کچەکە دەڵێ: باوکە من لەسەر ئایینی مەسیحی و ئەو لەسەر ئایینی ئیسلامە چۆن دەبێ مەگەر ئەو بێتە سەر ئایینی مەسیحی..ڕاهیبەکە دەڵێ: ئەی ئەگەر هاتە سەر ئایینی تۆ شووی پێ دەکەیت..کچەکە: بەڵێ..شێخ گوێی لەم گفتوگۆیەی باوك و کچەکە دەبێ، شەیتانیش هەر کارەکەی لەبەر چاو جوان و شیرین دەکات، هاوڕێکانیشی هەروا نووستوون..شێخ کە گوێی لە قسەکانیان دەبێ دەچێتە کنیان و

دەڵێ: ڕازیم، ئەوا ئایینی ئیسلامم بەلاوەنا و هاتمە سەر ئایینی تۆ..کچەکە دەڵێ: ئەدی مارەییەکەم چی دەبێ؟ وات دەبینم پیاوێکی هەژار بیت بۆیە لە بەرامبەر مارەییەکەمدا ساڵێك شوانێتیی ئەم ڕەوە بەرازەم بۆ بکە.. شێخ دەڵێ: ڕازیم بەڵام بەو مەرجەی ڕووی خۆتم لێ نەشاریتەوە، بەیانی و ئێواران دەبێ تەماشات بکەم..کچەکە: بەڵێ باش..

شێخ ئەو دارعەسایەی پێی بوو دەست دەداتێ و ڕەوە بەراز دەداتە پێش خۆی تا بیانلەوەڕێنێ..هێشتا هاوڕێکانیشی نووستوون، کاتێ بەئاگا دێن بە دوای شێخدا دەگەڕێن نایدۆزنەوە، لە ڕاهیبەکەیان پرسی، ئەویش ورد و درشتی چیرۆکەکەی بۆ گێڕانەوە..کاتێ قوتابییەکانی چیرۆکەکەیان بیست سەریان سوڕما و مێشکیان لە کەللەدا نەما..هەبوو بوورایەوە، هەبوو دەستی بە گریان کرد، هەبوو ئاخ و ئۆفی بۆ هەڵدەکێشا..هەستان چوونە لای شێخەکەیان و لە ڕووداوەکەیان کۆڵییەوە، زۆر ئامۆژگارییان کرد و خوا و پێغەمبەریان بەبیرهێنایەوە و قورئان و فەرموودەیان بۆ خوێند هیچ سوودی نەبوو، گوتی: لێم گەڕێن، من لەو شتانە لە ئێوە باشتر دەزانم بەڵام ئەوە بەڵایەکە لە خواوە بۆم هاتووە..قوتابییەکانی زۆر هەوڵیان لەگەڵدا سوودی نەبوو کاتێ لێی

بێهیوا بوون بە داخ و خەفەتەوە بەرەو سەفەرەکەیان چوون و حەجیان کرد و گەڕانەوە..

لە ڕێی گەڕانەوەدا دووبارە چوونەوە لای و ئامۆژگارییان کردەوە، بەڵام هیچ وەڵامی نەبوو، بۆیە دیسان بە خەم و پەژارەوە بەجێیان هێشت..کاتێ هەندێك لە (دێر)ەکە دوور کەوتنەوە ڕەشاییەك لە دوورەوە بانگیان دەکات، کاتێ دەوەستن دەبینن شێخەکەیانە دوایان کەوتووە، هەر کە دەگاتە کنیان یەکسەر دەڵێ: أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أن محمدا رسول الله، دەڵێ: ئەوا تۆبەم کرد و گەڕامەوە لای خوا، ئەوەی بەسەریشم هات بە هۆی تاوانێکەوە بوو کە پێشتر کردبووم، خوداش بەو بەڵایە سزای دام..ئیتر هەموان زۆر دڵخۆش دەبن و دەگەڕێنەوە بەغدا و شێخیش لە جاران زیاتر سەرگەرمی خواپەرستی و زانست دەبێ.

ڕۆژێکیان لەماڵی شێخ قوتابییەکان دەرس دەخوێنن ژنێك لە دەرگا دەدا، کە دەرگای لێ دەکەنەوە و لێی دەپرسن: چیت دەوێ؟ دەڵێ: شێخم دەوێ..پێی بڵێن: کچی فلان ڕاهیب هاتووە لەسەر دەستت موسڵمان ببێت..دێتە ژوورەوە لای شێخ و دەڵێ: یا شێخ هاتووم لەسەر دەستت موسڵمان ببم..شێخ دەڵێ: ئەمە چۆن ڕوویدا و چیرۆکەکەت چییە؟ دەڵێ: کاتێ تۆ ڕۆیشتی نووستم و لە خەوندا

عەلیی کوڕی ئەبو تاڵیبم دیت دەیگوت: جگە لە ئاینی محمد هیچ ئاینێکی تر ڕەوا نییە..سێ جار ئەمەی گوت، خوای گەورە بەخۆڕایی بە هۆی پیاوچاکێك لە پیاوچاکەکانی تاقیت ناکاتەوە..ئەوا ئێستا منیش هاتوومە لات و دەڵێم: أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أن محمدا رسول الله...

شێخ زۆر بەمە دڵخۆش دەبێ کە خودا هیدایەتی داوە بۆ ئیسلام و هەر لەوێ بەپێی شەرعی خوا مارەی دەکات..

لەبارەی ئەو تاوانەی شێخ کردبووی لێی دەپرسن، دەڵێ: من بە کۆڵانێکدا دەڕۆیشتم پیاوێکی مەسیحی هاتە لام و خۆی پێوە هەڵواسیم..منیش گوتم: لێم دوورکەوە نەفرەتی خودات لێ بێت..گوتی: بۆچی؟ گوتم: من لە تۆ باشترم..گوتی: چووزانی تۆ لە من باشتریت؟ تۆ دەزانی چی لە کن خودا هەیە تا ئەم قسەیە بکەیت؟ دواتر زانیمەوە کە کابرای مەسیحی موسڵمان بووە و ئایینی ئیسلامی بەجوانی جێبەجێ کردووە..خوداش لەسەر ئەوە سزای دام هەروەك بینیتان..

# بەشی دوازدە

## مووسپیبوون ئاگادارکردنەوەیە

ئـەی کۆمەڵـەی تۆبـەکاران، وەرن بـا بگـرین، ئەمـە پرسـە و ماتەمینی خەمەکانە، وەرن با ئەسرین ببارێنین و سکاڵای دابڕان بکـەین بـەڵکو وەکـو جـاران سـەردەمی ویسـاڵ و بەیەکگەیشـتن بگەڕێتەوە، ئەم مووسپیبوونە ئاگادارکردنەوەیە..ئەی ئـەو کەسـەی هـەر لـە دواوە بوویـت تـا پـیر بوویـت، وا کـاروان ڕۆیشـت..ئەی سەرلێشـێواو و سـەرگەردان، بـە ڕۆژ خـەریکی دونیـا و پـارە پەیداکردنیت و بـە شـەویش لـە خـەوی قووڵـدایت، بەڕاستی ئەمـە دۆڕاندن و زیانێکی ئاشکرا و دیارە کە تەمەنی گەنجێتیت بڕوا و هیچ قازانج نەکەیت، بەدڵنیاییەوە لە پیریشدا بەشت هەر دۆڕان و زیانە.. هیوا و ئـاواتی زۆر و دوورت هەیـە، کەچـی ڕەنگـە ئێسـتا کفنـت بـۆ ئامادە کرابێت..لە کەناری تەوبـەدا بوەسـتە چـونکە دەریـای تـاوان لافـاوە و دەتبـات، بـەهاری لاوێتیـی خـۆت بـە خەسـاردا و لـە سەرپێچیی خوادا نقوم بوویت، لە کاتی هاتنی پیریشدا لەوەی ڕابرد پەشیمان بوویتەوە، ئەگەر تەوبەی ڕاستەقینە نەکەیت لە ڕەحمەتی خودا بێبەشیت..

## ئامۆژگارییەکی حەسەنی بەسری

لـە حەسـەنی بەسـرییەوە گێڕدراوەتـەوە کـە گوتوویـەتی: ئـەی بنیـادەم، دونیـا و دواڕۆژت هەیـە، بـاوی دونیـات مـەدە بەسـەر دواڕۆژت، سوێند بە خوا خەڵکانێکم بینی باوی دونیایـان دا بەسـەر دواڕۆژیـان لەناوچـوون و ڕیسـوا بـوون ئـیتر ئابڕوویـان چـوو..ئەی بنیـادەم، دونیـات بـە ئـاخیرەت بفرۆشـە هـەردووکیان دەبەیتـەوە، ئاخیرەتت بە دونیا مەفرۆشە چونکە هەردووکیان دەدۆڕێنیت..ئـەی بنیادەم، بە خۆشـی و ناخۆشـیی دونیـا فریـو مـەخۆ ئەگـەر خێری ئاخیرەتت مسۆگەر بوو، خۆشیی دونیا چ سوودێکت پـێ دەگەیـەنێ ئەگەر لە خێری ئـاخیرەت بێبـەش بوویـت؟! ئـەی بنیـادەم، دونیـا وەکو پشتی سوارییەك وایە ئەگەر سواری پشتی بوویت هەڵتدەگرێ و ئەگـەریش هـەڵت گـرت دەتکوژێ..ئـەی بنیـادەم، تـۆ بـە کـار و کردەوەکانـت بەسـتراویتەوە و ڕۆژی مردنیشـت دێـت و دەچـیتەوە بەردەم پەروەردگارت، بۆیە لەوەی لەبەردەستتە شتێك هـەڵگرە بـۆ داهاتووت، لە کاتی مردنت خێر و چاکەکانت بـە کـەڵکت دێن...ئـەی بنیادەم، دڵت مەبەستەوە بە دونیا، چونکە دونیا خـراپترین شـتێکە بۆ دڵ پێوەبەستن، ئەوەندەت لە سامانی دونیا بەسە تا پێی بژی و بگەیتە مەنزڵ.

# بەشی چواردە

## توێشووی سەفەرێکی دوور ئامادە بکە

ئەی ئەو کەسەی لە گومڕاییدا بێ ڕێنیشاندەر و بێ توێشوو سەرگەردانیت، کەی بەئاگا دێیتەوە و دەسبەرداری کۆکردنەوەی دینار و دراو دەبیت، پێم بڵێ: کەی بەخەبەر دێیت؟

بزانە ڕابردووی لاوێتی ناگەڕێتەوە، ماڵوێران چۆن بە بێ توێشوو بەرەو سەفەری ئاخیرەت تۆغر دەکەیت؟! ئەگەر ئامادەکارییت بۆ سەفەری ئاخیرەت نەکرد و نەخۆش کەوتیت، خەڵك سەری لێدایت و توانای ڕەفتارکردنت لەو ماڵ و موڵکە نەما کە کۆتکردۆتەوە و داخ و حەسرەت جەرگی لەت لەت کردیت و فریشتەی مەرگ هاتە سەرت و ڕۆحی کێشایت، خستیانتە ناو تابووت و شۆڕی ناو گۆڕی تەنگیان کردیتەوە، ئەو کات قوڕبەسەری و ماڵوێرانی ڕووت تێ دەکات..بۆیە تا کاتت بە دەستەوە ماوە ماڵی تاعەت و خواپەرستی ئاوەدان بکەوە و ڕوو لە خوا بکە، چونکە کاڵای تاوان هەمیشە مایەی زیان و خەسارەتە: ﴿كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ (٢٠) وَتَذَرُونَ الْآخِرَةَ (٢١)﴾ (القيامة: ٢٠-٢١) واتە: نەخێر، وانییە (زیندووکردنەوە و لێپرسینەوە هەر دەبێت) دیارە ئێوە هەر ئەم دنیایەتان خۆش

دەوێت کە بەپەلە بەسەر دەچێت. قیامەت و بەهەشت پشتگوێ دەخەن و وازی لێدەهێنن.

## گۆڕانی ڕۆژگار

موحەممەدی کوڕی غەسال گەورە و دادوەری کووفە دەڵێ: لە ڕۆژی جەژنی قوربانـدا چـوومە کـن دایکـم، پیرێـژنێکی لـە لا بـوو جلوبەرگێکی کۆن و شڕی لەبەربوو، زمانێکی تەڕ و پـاراوی هـەبوو، بـە دایکمـم گـوت: ئەمـە کێیـە؟ گـوتی: عانیـەی پوورتـە" دایکـی جەعفەری بەرمەکیی وەزیری هارونە ڕەشیدە..منیش سڵاوم لێکرد و ئەویش سڵاوی لێکردم، لە بارودۆخیم پرسی و پێم گـوت: دونیـا وای بە سەر هێنایت کە دەبینی؟ گـوتی: بـەڵێ کوڕەکـەم، دونیامـان بـە خواسـتن وەرگرتبـوو کـە دواتـر لێـی وەرگرتینـەوە..گوتم: هەنـدێك باسی خۆتم بۆ بکە..گوتی: شتێکت پێ دەڵێم ئیتر ئەمە بکە پێـوەر بۆ ئەوانی تریش، سێ ساڵ لەمەوبەر لە ڕۆژێکی جەژنی وەکو ئەمڕۆ چوار سەت کەنیزەکی جوانی خزمەتکارم لەبەردەستدا بـوو، کەچـی هێشتا ناڕازی بووم و پێم وابوو کوڕەکەم خراپ و ئـازاردەرە، تـەنها بۆ قوربانیکردن هەزار مەڕ و سێ سەد گای بۆ ناردم، ئەمە بێجگە لە جلوبەرگ و جوانکاری..کەچی ئەمڕۆ وا هـاتووم بـۆ لای ئێـوە داوای دوو پێسـتەی مـەڕ دەکـەم بیکەمـە بـەرگی ڕۆژ و شـەوم..ئیتر ئـەم

قسانە و ئەو دۆخەی تێیدا دیتم خەمباری کردم و گریانم بۆی هات، بۆیە ئەو چەند دینارەی پێم بوو دامێ.

**براکەم:**

سەیری حاڵ و باری دونیا بکە چۆن دەگۆڕێ و چۆن خۆشیی و نیعمەتەکانی نامێنن، لەخۆبایی و هەڵخەڵەتاو ئەو کەسەیە فریوی پێ بخوات، بەختەوەریش ئەو کەسەیە عەیب و نەنگییەکانی ببینێ و لێی ڕابکات، موسیبەتەکانی دونیاش چەند جۆرێکن: هەیە بە هۆی ماڵ و منداڵ تووشی بەڵا دەبێ و هەشە بە دوورخستنەوە و دەرکردن لە ئیسلام گرفتار دەبێ.

# بەشی پازدە

## تاوان دەکەیت و پەشیمان نابیتەوە

ئەی ئەو کەسەی تاوان و گوناھ دەکەیت و تەوبە ناکەیت، چەند تاوانت لەسەر نووسراوە؟! واوەیلا بۆ تۆ، واز لە هیوا و ئاواتی درۆیینە بێنە، داوای چاکبوونت لێ دەکەین و تۆش ناگەڕێیتەوە و هەر لەسەر گوناھ بەردەوامیت.

لە حەسەنی بەسرییەوە گێڕدراوەتەوە کە گوتوویەتی: بە خەڵکانێك گەیشتووم کە هەیانبووە پەنجا ساڵ لەسەر جێگا نەنووستووە و هەرگیز فەرمانی بە خێزانەکەی نەکردووە چێشتی بۆ ئامادە بکات، هەمیشە لەسەر زەوی پاڵکەوتووە و بە هیچ شتێکی دونیا دڵخۆش نەبووە، بە لەدەستدانی هیچ شتێکی دونیا دڵتەنگ نەدەبوون و دونیایان لە لا وەکو ئەو خۆڵە بێنرخ بوو کە ئێوە بەسەریدا دەڕۆن، هەیانبوو زۆر بەسەختی دەژیا و ماڵی حەلاڵیش بە تەنیشتیەوە بوو، دەیانگوت: بۆ شتێك لەو ماڵە هەڵناگری بیخۆیت؟! دەیگوت: نەخێر، سوێند بە خوا دەترسم ئەگەر شتێکم هەڵگرت ببێتە هۆی تێکچوونی دڵ و دینم.

## زوهدی سەلمانی فارسی

لە سەلمانی فارسییەوە گێڕدراوەتەوە کە ژنێکی لە هۆزی کیندە مارەکرد بە ناوی (صواب) کە گواستییەوە لەبەر دەرگای ماڵ وەستا و بانگی کرد ئەویش وەڵامی نەدایەوە، پێی گوت: هێی ئەتوو، لاڵیت یان کەڕیت؟! نابیستی؟ ژنەکە: ئەی هاوەڵی پێغەمبەر نە لاڵم و نە کەڕ، بەڵام بووك شەرم دەکات قسە بکات..سەلمان دەچێتە ژوور دەبینێ بە پەردە و پەڕ و ئاوریشم ڕازاوەتەوە..دەڵێ: کچێ، ئەم ماڵەی تۆ چواردەور دراوە وا داتپۆشیوە یان کەعبە هاتۆتە کیندەوە؟! ژنەکە: ئەی هاوەڵی پێغەمبەر، بووك حەزی لە ماڵی ڕازاوەیە..سەلمان سەری بەرز دەکاتەوە دەبینێ چەند خزمەتکارێك ئاو و خواردنیان بۆ هێناوە و لەسەر سەری وەستاون..دەڵێ: ئەو هەموو خۆشگوزەرانی و بایەخدانە بە دونیا لەگەڵ زوهد و دونیانەویستی تێك ناکاتەوە..ژنەکە دەڵێ: ئەی هاوەڵی پێغەمبەر ئەوا تۆم کردە شایەت لەسەر ئەوەی هەموو کەلوپەلی ناو ماڵەکە لەپێناو خودا سەدەقەیە و سەرجەم بەندەکانیش لەپێناوی خودا ئازادن..چاکە و باشیی تۆ بۆ من بەسە و کاروباری ماڵ و گوزەرانیش لەسەر من. سەلمانیش دەڵێ: خودا ڕەحمت پێ بکات و یارمەتیت بدات.

# بەشی شازدە

## لە خەوی بێئاگایی بێداربەوە

ئەی بێئاگا لە چارەنووسی خۆت، ئەی کەمتەرخەم، خەڵکی خاوەن ئیرادە هەموو پێشت کەوتن کەچی تۆ هێشتا هەر لە دەریای غەفڵەت مەلە دەکەیت، لەبەر دەرگای خودا بە پەشیمانییەوە بوەستە، سەری کز و زەلیلت دانەوێنە و بڵێ: من ستەمکارم، لە بەرەبەیانەکاندا بانگ ڕادێرە و تاوانباریی خۆت ڕاگەیەنە و داوای سۆز و بەزەیی خودا بکە، تێکەڵی تۆبەکاران بە و بڕۆ ڕیزی ئەوانەوە، بناڵێنە و با ئاه و نزولەت بگاتە کەشکەشانی ئاسمان و ئەسرین ببارێنە، لە تاریکاییی شەودا هەستەوە و لە خودا بپاڕێوە، بە تەوبەوە بچۆ بەر دەرگای، ئەوەی لە تەمەنت ڕۆیشتووە قەرەبووی بکەوە، واز لە گەمە و یاری بێنە، ئەگەر خوازیاری ئاخیرەتیت دونیا سێ بە سێ تەڵاق بدە.

ئەی خەوخۆش و خەوتوو بە درێژاییی شەو، هاوڕێکانت و خەڵك هەموو ڕۆیشتن تۆش هێشتا هەر خەوتوویت و بێدار نەبوویتەوە.

## وریاکردنەوە

ئیاسی کوڕی قەتادە گەورەی بنەماڵەکەی بوو، ڕۆژێکیان موویەکی سپی لە ڕیشیدا بینی، گوتی: ئەی خودایە پەنات پێ دەگرم لە شتی لەناکاو، وا دەبینم مردن داوام دەکات و لە دەستی قوتارم نابێ...پاشان چووە لای بنەماڵەکەی و پێی گوتن: ئەی بەنی سەعد گەنجێتیی خۆم بە ئێوە بەخشی، ئێوەش پیرێتیی خۆم پێ ببەخشن...ئیتر چووە ماڵەوە و تا مرد هەر خەریکی خواپەرستی بوو.

## ئامۆژگاری

لە حەسەنی بەسرییەوە گێڕدراوەتەوە کە گوتوویەتی: ئەی مرۆڤ، پەڕاوی کردەوەکانت هاتۆتە خوارەوە و دوو فریشتەی بەڕێزت پێ سپێردراون، یەکێکیان لە لای ڕاستت و ئەویتر لای چەپت، ئەوەی لای ڕاست چاکەکانت دەنووسێ و ئەوەی چەپیشت خراپەکانت دەنووسێ. چیت گەرەکە بیکە، کەم یان زۆر تا ئەو کاتەی دونیا بەجێ دێڵی، ئەو دەم پەڕاوی کردەوەکانت دەپێچرێتەوە و بە ملتەوە دەکرێ، کە ڕۆژی قیامەت داهات دەردەهێنرێ و پێت دەگوترێ: ﴿اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا﴾(الاسراء: ١٤) واتە: دەی نامەی کردەوەکانت بخوێنەرەوە

و تەماشای بکە، ئەمڕۆ هەر خۆت بڕیار بدەو حساب بۆ خۆت بکە (شایستەی چ جۆرە پاداشتێکیت؟!)

## خۆت لە خۆت بپرسەوە

براکەم، لە دادپەروەریی خواوەیە کە خۆتی کردۆتە بەرپرس و موحاسیبی خودی خۆت.

ئەی بنیادەم، بزانە کە بەتەنیا دەمریت، بەتەنیا دەچیتە ناو گۆڕەوە، بەتەنیا زیندوو دەبیتەوە، هەر بەتەنیاش لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکرێت..

ئەی بنیادەم، ئەگەر هەموو خەڵك گوێڕایەڵی خودایان کرد و تۆ سەرپێچیت کرد ئەوا ئەو گوێڕایەڵییەی ئەوان هیچ سوودێکی بۆ تۆ نییە.

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم تووشی پیاوێك بوو، کابرا لێی پرسی: حاڵ و بارت چۆنە ئەبو ئیسحاق؟ لە وەڵامدا ئیبراهیم کوڕی ئەدهەم گوتی:

نرقع دنيانا بتمزيق ديننا فلا ديننا يبقى و لا ما نرقع

فطوبى لعبد لآثر الله ربه و جاد بدنياه لمـــا يتوقع

بــە درانــدن و پارچــە پارچــەكردنی دینەكــەمان دونیاكــەمان پینەوپەڕۆ دەكەین، كەچی نە دینەكەمان بۆ دەمێنێتەوە نە ئەوەی پینەی دەكەین.. خۆشی و بەختەوەری بۆ بەندەیەك كە باوی خودای بەسـەر هـەموو شـتێكدا و دونیـای كـردە قوربـانیی چـارەنووس و دواڕۆژی.

## وریابە باوی دونیا نەدەیت بەسەر دواڕۆژەوە

عەونی كوڕی عبدوڵڵا دەیگوت: هاوار بۆ خۆم چۆن بێئاگا دەبم و خودا لێم بێئاگا نابێ، چۆن تام و چێژ لـە ژیـان وەردەگرم و ڕۆژی دژوار لە دوامەوەیە؟! چۆن دەسپێشخەری بە كار و كـردەوەی چـاك ناكەم و نازانم كەی ئەجەلمە؟! چۆن بە دونیا كەیفخۆش دەبم و حاڵ و بارم تێیدا بەردەوام نـابێ، یـان چـۆن بـاوی دونیـا دەدەم بەسـەر قیامەت لە كاتێكدا ئەوەی بەر لە من دونیای هەڵبژاردووە هەر دونیا زیانی پێگەیانـدووە؟! چـۆن بـە دوای دونیـا ڕاكـە ڕاكـەم دەبـێ لـە كاتێكدا نیشتەجێبوون و نـەمریم لـە شـوێنێكی تـرە؟! چـۆن پێـی سەرسام دەبم لە كاتێكدا ئەو مانـەوەی بـۆ نییـە و لـێم دادەبـڕێ؟! چۆن هەمیشە خەمبار نابم لە كاتێكدا نازانم لەسـەر تاوانـەكانم چـیم پێ دەكرێ؟!

## ماڵی پێغەمبەر ﷺ

لە حەزرەتی عائیشە گێڕدراوەتەوە کە گوتوویەتی: جاری وا هەبووە چل شەو لە ماڵی پێغەمبەردا ﷺ نە چرا و نە ئاگر هەڵنەدەکران..پرسیان: ئەی بە چی دەژیان؟ دەیگوت: بە ئاو و خورما..

## دونیانەویستی

هاوسەری یووسفی کوڕی ئیسباط دەگێڕێتەوە و دەڵێ: یووسف پێی گوتم: سێ شتم لە خودا گەرەکە..گوتم: ئەو شتانە چین؟ گوتی: حەز دەکەم کە مردم هیچم نەبێ، قەرزار نەبم، گۆشت بەسەر ئێسکمەوە نەبێ..خودا هەموو ئەوانەی پێدا، لە کاتی نەخۆش کەوتنیدا پێی گوتم: هیچ شتێکت لە کن ماوە بۆ خەرجی؟ گوتم: نا..گوتی: چ شتێکت دەوێ؟ گوتم: ئەو گۆزەیە ببە بازاڕ و بیفرۆشە..گوتی: ئەگەر ئەوەم کرد ئاشکرا دەبێ و خەڵك دەڵێن لەبەر پێویستی فرۆشتوویانە..

مەڕێکمان هەبوو بە دیاری بۆیان هێنابووین..بردیە بازار و بە ١٠ درهەم فرۆشتی..پێی گوتم: یەك درهەم بۆ بۆنخۆشکردنی تەرم و کفنەکەم بهێڵەوە و ئەویتری ببەخشە..

ئیتر مرد و هیچی لەپاش بەجێ نەما تەنها ئەو درهەمە نەبێ کە بۆ بۆنخۆشکردنی تەرمەکەی بەلاوەم نابوو..

# بەشی حەڤدە

## مارەییی ئاخیرەت کەمە

**براکەم:**

تەنها کەسی دۆڕاو ئاخیرەت بە دونیا دەگۆڕێتەوە، نەکەیت هۆگری شتێك ببیت کە بەجێی دێڵیت و پاشان سەرگەردان بمێنیتەوە.. هاوڕێی خواناسی، هاوڕێی ڕاستەقینەیە، هاوڕێی تاوان و سەرپێچی بێ ئەمەکە، مارەییی ئاخیرەت کەم و ئاسانە، تەنها دڵێکی خاوێن و دڵسۆز و زمانێکی بەزیکری گەرەکە، ئەگەر دڵ و زمانت لەسەر خواناسی جێگیر بوو ئەوا بزانە تۆ ڕێی ڕاستت گرتووە و بەردەوام بە..

زوننونی میسری دەڵێ: لە کەناراوێکدا لاوێکی ڕەنگزەردم بینی، نور لە ڕووی دەدرەشایەوە و شوێنەواری خۆشەویستیی و هۆگریی خودام تێیدا هەست پێ کرد، سڵاوم لێکرد و لێم پرسی: نیشانەی خۆشەویستی چییە؟ گوتی: پەرتەوازە بوون لە وڵات، گوێنەدان بە خەڵك، خەو لە خۆ حەرامکردن، بالیفێکی بەردین.

## حەقیقەتی خۆشەویستی

(أبوبكر الوراق) دەڵێ: حەقیقەتی خۆشەویستی ئەوەیە لە هەموو حاڵ و بارێکدا خۆشەویستەکەت لەبەرچاو بێت، چونکە سەرقاڵبوون بە غەیری ئەو ونبوون و شاردنەوەی خۆشەویستە، بنچینەی خۆشەویستییش تەسلیمبوون و یەقینە..ئەوەی ئەم سیفەتانەی هەبێ دەگاتە پلەی خواناسان و شوێنی بەهەشتی خودایە.

أُحِبُّ الصالحين و لستُ منهم وأطلب أن أنال بهم شفاعة
و أكره مَن بضاعته المعاصي و لو كنّا سواء في البضاعة

ئەگەرچی لەوانیش نیم بەڵام پیاوچاکانم خۆشدەوێ و خوازیارم بە هۆی ئەوانەوە بکەومە بەر شەفاعەتی خوداوە، ڕقم لەو کەسانەیە کاڵایان سەرپێچییە ئەگەرچی لە کاڵادا هەردووکمان وەکو یەکین..

# بەشی هەژدە

## دیلی غەفلەت

ئەی دیلی چنگی غەفڵەت، ئەی ژێرکەوتووی سەرمەستیی مۆڵەتی خودا، ئەی پەیمانشکێن، بڕوانە پەیمانت لەگەڵ کێدا بەستووە، زۆربەی تەمەنت ڕۆیشتووە کەچی تۆ هێشتا هەر بڕوبیانوو دێنیتەوە.. ئەی ئەو کەسەی داوای خۆپڕزگارکردنت لێ دەکرێ و تۆش هەر تەنبەڵی دەکەیت، چییە ئەم ساردوسڕی و سستییە؟! وا تەمەنت بەرەو خوارە و نزیکی گۆڕ دەبیتەوە.

## سپلەیی

دەوڵەمەندێك هەبوو زۆر سوپاسگوزاری خودا بوو، ماوەیەك تێپەڕی لەخۆبایی بوو و ڕووی کردە سەرپێچی و بێفەرمانیی خودا، بەڵام حاڵ و باری هەروەك خۆی ما و بەخششی خودا بۆی هەر بەردەوام بوو..ڕۆژێك گوتی: ئەی خودایە، گوێڕایەڵی و خواپەرستیم وەکو جاران نەما و گۆڕام، بەڵام تۆ هەر بەخششەکانت بۆم بەردەوام بوون!!..دەنگێکی هاتە گوێ کە دەیگوت: ئەی فلان، ڕۆژانی ویساڵ و پەیوەندی لای ئێمە ڕێز و حورمەتی هەیە، ئێمە پاراستوومانە بەڵام ئەوە تۆی فەرامۆشت کردووە.

## ئامۆژگاریی حاتیمی ئەسەم

پیاوێك بە حاتیمی ئەسەمی گوت: بە نیازی سەفەری حەجم، ئامۆژگارییەکم بکە...حاتیم پێی گوت: براکەم، ئەگەر هاودەمت ویست ئەوا قورئان بکە هاودەمی خۆت، ئەگەر هاوڕێت ویست فریشتەکان بکە هاوڕێت، ئەگەر خۆشەویستت ویست ئەوا خودا ئاگای لە دڵی خۆشەویستەکانییەتی، ئەگەر توێشووت ویست ئەوا یەقین بە خوای گەورە باشترین توێشووە.

## ژنە خواپەرستێك

ئەسمەعی دەڵێ: بە بیاباندا دەڕۆیشتم، ژنێکم دیت لە جوانیدا دەتگوت مانگی چواردەیە، لێی نزیك بوومەوە و سڵاوم لێی کرد و ئەویش بەجوانی وەڵامی دامەوە، پاشان گوتم: ئەی ژن، هەمووم بە هەمووت سەرقاڵە! گوتی: هەمووم بە هەمووت پێشکەش! !بەڵام ئەگەر بە جوانیی من سەرسامیت تەماشایەکی دواوەی خۆت بکە لە من جوانتر دەبینی..تەماشای دواوەی خۆم کرد کەسم نەبینی..ئیتر هاواری بەسەرمدا کرد و گوتی: بڕۆ لێم دوورکەوە ئەی بێکاری بێکەڵك، کە لە دوورەوە تۆم بینی وام دانا کە عارف بیت نەك عاشق، لافی خۆشەویستیم لێ دەدەیت و تەماشای غەیری من دەکەیت و هێشتاش دەستیشت نەگەیشتۆتە من.

پاشان پشتی تێکردم و ڕووی کردە ئاسمان و هاواری کرد: خودایە، ئارەزووی ویسالَ دەربەدەری کردم ئاخ ئاخ، ترسی دابڕان بێزاری کردم ، ئاخ لە دابڕانی بەر لە بەیەکگەیشتن، حالَی من وەکو بازرگانێکە کەشتییەکەی نقووم بووبێت پاشان خۆی ڕزگار بێت بەلاّم سەرگەردان بێت و ڕێ ون بکات..

# بەشی نۆزدە

## باشترین ئوممەت

**براكەم:**

خۆش بە حاڵی ئەو كەسانەی كە خودا بە نزیك خستنەوە لە خۆی بەهرەمەندی كردوون و لە خورپەی وەسوەسە و دڵەكرمێ دووری خستوونەتەوە، هەرێمی دڵیانی لە تۆز و خۆڵی ئارەزووبازی پاراستووە، ئەوانیش فەرمانی ئەویان قەبووڵ كردووە و لەسەر سەر و چاویان داناوە، بە كار و كردەوەكانیان توێشوویان بۆ سەفەری مەرگ و تاریكایی گۆڕ پێش خستووە، خوداش بەرگی ڕەزامەندی لەبەركردوون و بە ناوی خۆشەویستانی ژێر بانگی كردوون: ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾(ال عمران: ١١٠) واتە: ئێوە باشترین ئوممەتێكن كە بۆ خەڵك نێردراون.

## خواپەرستیی خواناسێك

ئەبو ئیسحاقی جەبەلی دەڵێ: چوومە لای عەلیی كوڕی عەبدولحەمیدی غزائری، سەرنجم دایێ جوانترین پەرستش و بەندایەتی بۆ خودا دەكات، شەو و ڕۆژ سەرگەرمی خواپەرستی و نوێژ بوو، چاوەڕێم كرد لێ ببێتەوە بەڵام بەردەست نەبوو، پێم

گــوت: دایــك و بــاوك و كەســوكار و وڵات و مــاڵ و منــداڵمان بەجێهێشــتووە و هــاتووین بــۆ لای تــۆ، ئەگــەر كــەمێك كاتمــان بــۆ تەرخان بكەیت و بەو زانستەی خودا پێی داویت هەندێ قسەمان بـۆ بكـەیت..گوتـی: دوعـای شـێخ (سـری السـقطی) پیاوچـاكم بـۆ گـیرا بووە، جارێكیان چوومە كنی و لە دەرگام دا، بەر لەوەی دەست بـە موناجات و لاڵانەوە لە خودا بكات گوێم لێ بوو دەیگوت: خودایە هەر كەسێك هات و لە موناجاتی تۆ مەشغولی كردم خۆت مەشغولی بكە و لە منی دوور بخەوە..

كە گەڕامەوە خودا ئەو چاكەیەی لەگەڵمدا كرد و مەشغولی نوێژ و زیكری خۆی كردم، بۆیە هەر شتێكی دەیكـەم بـە هـۆی بەرەكـەتی ئەو شێخەوەیە..

ئەبو ئیسحاق دەڵێ: هەستم كرد قسـەكانی لـە دڵێكـی خـەمبار و پەژارەیــەكی شــاراوەوە دەردەچــێ و چاوانیشــی فرمێســكیان دەباراند..

# بەشی بیست

## پاكبوونەوە لە تاوانەكان

**براكەم:**

چڵك و پۆخڵیی تاوانەكان بە ئاوی فرمێسكەكانت بشۆ، هیچ كەس لە دوكەڵی سەرپێچی و تاوان ڕزگاری نابێ مەگەر كەسێك لە تەوبەكردن و كاری چاكە دەستوبرد بكات، ساتێك دڵت بێدار بكەوە بەڵكو بە گریە و زاریی ئامۆژگاری بەخۆدێتەوە..من چەندە ئامۆژگاریت بۆ دەخوێنمەوە كەچی پێناچێ تۆ گوێ بگریت!

بەڵام ڕۆژی سەرپێچی چ ڕۆژێكی بەدبەختییە! ڕۆژی تاعەتیش چ ڕۆژێكی ئاسوودەییە! واوەیلا بۆ تۆ، هاوڕێیەتیی تۆبەكاران بكە و پەیامەكانت بۆ خۆشەویست نوێ بكەوە، چرای تەقوا ڕێگات بۆ ڕۆشن دەكاتەوە، تاریكاییی غەفڵەت چەند پڕ لە كۆسپ و تەگەرەیە!..هاوار بۆ تۆ ئەی داماو، بۆ مردنی دڵ و كوێربوونی بینایی و زۆری بەربەرستەكان بگری..ئەگەر زەمانە و مووسپیبوون و لاوازی ئامۆژگاریت نەكەن ئیتر تۆ چی دەكەیت؟ بۆ خاتری خودا براكانم بەر لە هاتنی ڕۆژی لێپرسینەوە زوو تەوبە بكەن و بەخۆتاندا وەرنەوە.

## نهێنییەکانی نوێژ

بۆ یووسفی کوڕی عاسیم باس کرا کە حاتیمی ئەسەم لەبارەی زوهد و دڵسۆزییەوە قسە بۆ خەڵك دەکات، یووسف بە هاوڕێکانی گوت: وەرن با بچین لەبارەی نوێژەوە پرسیاری لێ بکەین..

چوونە لای حاتیم و یووسف گوتی: حاتیم هاتووین لەبارەی نوێژەوە پرسیارت لێ بکەین..گوتی: لەبارەی چیی نوێژەوە لێم دەپرسی: لەبارەی زانینیەوە، یان لەبارەی ئادابیەوە؟

یووسف ئاوڕی لە هاوڕێیەکانی دایەوە و گوتی: ئەوەی ئێمە لەبارەی پرسیارکردنەوە نەماندەزانی ئەو بۆی ڕاستکردینەوە! پاشان بە حاتیمی گوت: با بە ئادابەکانی دەست پێ بکەین..حاتیم پێی گوتن: بە فەرمان هەڵدەستی و بە چاوەڕێی پاداشت دەڕۆیت و بە سوننەت دەچیتە ناویەوە و بە مەزنکردن الله أكبر دەکەیت و بە تەرتیل قورئان دەخوێنی و بە خشوع دەچەمێیتەوە و بە ملکەچی کڕنووش دەبەیت و بە ئارامی هەڵدەسیتەوە و بەنیازپاکی تەحییات دەخوێنی و بە ڕەحمەت سەلام دەدەیتەوە..

یووسف گوتی: ئەوە ئادابەکانی بوو، ئەی زانینەکەی چییە؟
گوتی: ئەگەر بۆی هەستایت بزانە کە خودا ڕووی لە تۆیە تۆش ڕووی دڵتی تێ بکە، لە دڵەوە باوەڕت وابێ کە ئەو لێت نزیکە و توانای بەسەرتەوە هەیە، کە نووشتایتەوە ئومێدی قیت بوونەوەت نەبێ، کە قیت بوویتەوەش بەتەمای ئەوە نەبیت کڕنووش بەریت، کە کڕنووشیشت برد بە هیوا مەبە هەستیتەوە، وا بێنە بەرچاوت کە بەهەشت لە لای ڕاست و دۆزەخ لەلای چەپت و (صراط) لەژێر قاچتە، ئەگەر بەم شێوەیە نوێژت کرد ئەوا تۆ نوێژکەرێکی تەواویت..یوسف ئاوڕی بۆ لای هاوڕێیەکانی دایەوە و گوتی: هەستن با بچین ئەو نوێژانە دووبارە بکەینەوە کە پێشتر کردوومانن.

# بەشی بیست و یەك

## تاکەی دواخستنی تەوبە؟

ئـەی ئـەو کەسـەی هـەر پەشـیمانبوونەوە دوا دەخـەیت تـا پیردەبیت، ئـەی ئـەو کەسـەی لـە بێئاگاییـدا ڕۆژانـی گـەنجێتییت بەفیڕۆدا، ئەی دەرکراو لە بەر دەگای خودا بە هۆی تاوانەکانتـەوە، ئەگـەر لـە سـەردەمی لاوێتییـدا بێئاگـا بوویـت و لـە سـەردەمی پیرێتییش دواخەر بوویت و هەر ئەمڕۆ نا سبەیت دەکرد کەی لەبـەر دەرگای خودا دەوەستیت؟! چەندە بە ئەمەکەوە ڕەفتـارت لەگـەڵ کرا، خۆشەویستان وەها ناکەن، ڕواڵەتت ئاوەدانە و ناخیشت وێران، تاکـەی بێفـەرمانی، تاکـەی سەرپێچـی، تاکـەی ڕووپامـایی، تاکـەی دوورکەوتنـەوە لـە دەرگـای خـودا؟! تەمـەنی جوانـت لـە تاوانـدا بەسەربرد، ئاخۆ کەی دەگەڕێیتەوە بۆ سـەر ڕاسـتەڕێ؟! بەڕاسـتی بـۆ کەسـی پـیر بێشـەرمی ناشـرینە، ئەگـەر تـۆ لـە ئـاخروئۆخری تەمەنیشت چاکە بکەیت هەر باشە و لێپرسینەوە و حیسابت لەسـەر سووك دەبێ..

ئـیتر بەسـیەتی، وا تەمـەنت لـە غەفڵەتـدا بردەسـەر نـەك لـە بەدەمەوەهاتنی خـودا، مووسـپیبوون لـە ڕۆیشـتن و دونیاجێهێشـتن ئاگاداری کردییـەوە و تـۆش چ زاد و زەخیرەیـەکت بـۆ پـێش خـۆت

ڕەوان نەکردووە..خۆزگە بمزانیبایە سەرپێچیکەران چۆن چێژ لە ژیان دەبینن! ﴿ وَلَوْ تَرَى إِذْ فَزِعُوا فَلَا فَوْتَ وَأُخِذُوا مِنْ مَكَانٍ قَرِيبٍ﴾(سبأ: ٥١) واتە: ڕۆژێك دێت سەرپێچیکەران دەبینیت لەترسا خەریکن زیرە دەکەن، دڵنیان کە لە دەست دەرناچن و ڕزگار بوونیان ئەستەمە، ئیتر هەر لە نزیکەوە دەستگیر دەکرێن و باڵبەست دەکرێن.

## پەشیمانبوونەوەی ژمارەیەك گەنج

دەگێڕدرێتەوە کە موحەممەدی کوڕی واسیع ژمارەیەك گەنجی لە مزگەوتدا بینی کە لە دەریای بێئاگایی و گومڕاییدا ڕۆچووبوون، پێیانی گوت: ئایا لە هەر یەکێك لە ئێوە دەوەشێتەوە خۆشەویستێکی هەبێ بێفەرمانی بکات و کەسێکی تر بۆ خۆی ببیات؟! گوتیان: نەخێر..گوتی: ئێوە لە ماڵی خودا دانیشتوون و سەرپێچیی فەرمانەکانی دەکەن و غەیبەتی خەڵك دەکەن..گوتیان: ئەوا پەشیمان بووینەوە و تەوبەمان کرد..گوتی: کوڕەکانم، ئەو پەروەردگار و خۆشەویستتانە، ئەگەر ئێوە سەرپێچیتان کرد و غەیری ئێوە گوێڕایەڵیان کرد ئەوا ئێوە لە دەستی دەدەن و غەیری ئێوە دەیباتەوە، ئایا ئەوە زیان نییە بۆ ئێوە؟ گوتیان: بەڵێ..گوتی: ئەگەر یەکێك بێفەرمانی کرد و ئەویش سزای دا ئایا

بەرامبەر لاوێتیی خۆتان غیرەتان نییە کە چۆن بە ئاگر سزا بدرێ و کەسانی تریش بەهەشت و پاداشتیان دەستکەوێ؟! گوتیان: بەڵێ..ئیتر هەموویان تەوبەیان کرد و گەڕانەوە لای خودا..

## سەرەنجامی وازهێنان لە ئارەزووەکان

جارێکیان حەسەنی بەسری ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾(البقرة: ٢٨١) واتە: (خەڵکینە) لە سزاو تۆڵەی ڕۆژێك بترسن کە تیایدا بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، لەوەودوا هەموو کەس پاداشتی کار و کردەوەی خۆی وەردەگرێت و ستەمیان لێ ناکرێت.

گوتی: ئەمە ئامۆژگارییەکی خودایە بۆ موسڵمانان، ئەوەش لەوەوە هاتووە کە حۆریی بەهەشت لەگەڵ دۆستی خودا لە خۆشی و شادیی بەهەشتدان، دۆستی خودا لە کەناری ڕووباری هەنگویندا شانی داداوە و حۆرییەکەش پەرداخی هەنگوینی دەداتێ و پێی دەڵێ: ئەی دۆستی خودا دەزانی کەی خودا منی لە تۆ مارەکرد؟ دەڵێ: نازانم..حۆرییەکە: لە ڕۆژێکی گەرمی نیوەڕۆدا خودا تەماشای کرد وا ئەتوو لەو ڕۆژە گەرمەدا بەڕۆژوو بوویت و لە تینوێتییان لێوت وشك بووە، خودا لە کن فریشتەکان شانازی پێوە کردیت و گوتی: فریشتەکانم تەماشای بەندەکەم بکەن، لەبەر

خـاتری مـن وازی لـە شـەهوەت و خۆشـی و خێـزان و خـواردن و خواردنـەوە هێنـاوە، ئـەوا مـن ئێـوە دەکەمـە شـایەت کـە لێـی خۆشـبووم..ئیتر لـەو ڕۆژەوە خـودا لێـت خۆشـبوو و منـی لـە تـۆ مارەکرد..

# بەشی بیست و دوو

## ڕێبواری ڕێی دوور، بەڵام بێ توێشوو

ئەی ڕێبواری ڕێی دوور و بێ توێشوو، چاو وشك و دڵ ڕەقتر لە ئاسن، کێ لە تۆ زەرەرمەندترە؟! تۆ هەموو ڕۆژ زیاتر لە دەریای سەرپێچی نقوم دەبیت! نە لاوێتی بەئاگای هێنای نە جوامێری ترساندتی نە پیری جڵەوی گرتی! وا دەبینم چاکبوونت دوور بێت، خاوەن ئیرادەکان سەرکەوتوو بوون و فەزڵی زیاتریان وەدەسهێنا، ڕایەخی خەویان پێچاوە و بوونە هاودەمی گریان و کڕوزانەوە، فرمێسك بەسەر ڕووخساریان ڕێچکەی بەستووە و خەتی کێشاوە، تۆش ئەی بێ هیممەتی دەرکراو نە لە ئەهلی خۆشەویستی نە لە عاشقان!

## ترس و خاکەڕاییی داود

هاوڕێیەکی داوودی تائی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ڕۆژێك چوومە لای داود، پێی گوتم: چیت دەوێ؟ گوتم: سەردانت..گوتی: تۆ بۆ خۆت خێرێکت کردووە کە سەردانت کردووین بەڵام بڕوانە من چیم بەسەردێ کاتێ پێم دەوترێ: تۆ چیت تاوەکو بەندەکان سەردانت بکەن؟ ناوەڵڵا...تۆ لە زاهیدانی؟ ناوەڵڵا..پاشان داود دەستیکرد بە

سەرزەنشتکردنی خۆی و دەیگوت: تۆ لە سەردەمی لاوێتیدا لادەر(فاسق) بوویت، لە جوامێریدا ئەم لا و ئەو لات دەکرد، کە پیربوویت بوویتە ڕیاکار، ناوەڵلا، ڕیاکار لە لادەر خراپترە..پاشان دەستیکرد بە پاڕانەوە لە خودا و دەیگوت: ئەی خودای ئاسمان و زەوی ڕەحمەتێکی خۆتم پێ ببەخشە، کە لاوێتیم چاك بکات و لە خراپەی خۆم بمپارێزێ و پلەوپایەم بەرز بکاتەوە بۆ لای پلەوپایەی پیاوچاکان.

## چیرۆکی شەیبانی ڕاعی

عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڕحمان دەڵێ: سوفیانی سەوری لەگەڵ شەیبانی ڕاعی دەچێتە حەج، لە ڕێگادا تووشی شێرێك دەبن، سوفیان دەڵێ: بزانە ئەم شێرە چۆن ڕێی لێ گرتووین و خەڵك دەترسێنی؟! شەیبان دەڵێ: مەترسە..کاتێ شێرەکە گوێی لە دەنگی شەیبان بوو کلکەلەقێی بۆ کرد، شەیبانیش گوێی گرت و دەستی پێدا هێنا، ئەویش کلکەلەقێی بۆ دەکرد، دواتر ڕایکرد و تێی تەقاند..سوفیان گوتی: ئەم ناوبانگە چییە شەیبان!؟ گوتی: ئەمە ناوبانگە سوفیان؟! ئەگەر مەبەستم ناوبانگ بووایە توێشووەکەم دەخستە سەر پشتی و تا مەککە نەدەوەستام!

# بیست و سێ

## تەمەنی خۆت لە گەمە و گاڵتەدا بەسەربرد

**براکەم:**

تەمەنی خۆت لە گەمە و گاڵتە بەسەربرد و غەیری تۆش بە ئامانج گەیشتن، تۆش لەو ئامانجە بەدووریت، غەیری تۆ لەسەر ڕاستەڕێیە و تۆش کەوتوویتە ناو قوڕ و چلْپاوی ئارەزووبازی، ئاخۆ دەبێ ئەو ڕۆژە کەی بێت بڵێن: فلان کەس وازی لە تاوان هێنا و گەڕایەوە لای خودا؟! ئای چ ڕۆژێکی خۆشە! کەی ئارەزوو تووڕدەدەیت و دەگەڕێیتەوە لای خودای گەورە؟!

ئەی داماو، ئەگەر وەکو تۆبەکاران بوویتایە کە ئاسوودەییان لە نوێژ و زەکات و زوهد و دونیانەویستی دایە، بەڵام بە داخەوە ئێوەی بێبەش لەو نیعمەتانە تەمەنی لاوێتیتان لە غەفڵەت و تەمەنی پیریتان لە دونیاپەرستی و ئومێدی دوور و درێژ بەسەربرد، نە لە گەنجیدا لە خودا ترسای و نە لە پیریشدا گەڕایتەوە لای خودا، ئەی بەفیڕۆدەری لاوێتی و پیرێتی! ﴿ وَلَوْ تَرَى إِذْ فَزِعُوا فَلَا فَوْتَ وَأُخِذُوا مِنْ مَكَانٍ قَرِيبٍ﴾(سبأ: ٥١) واتە: ڕۆژێك دێت سەرپێچیکەران دەبینیت لەترسا خەریکن زیڕە دەکەن، دڵنیان کە لە دەست

دەرناچن و ڕزگار بوونیان ئەستەمە، ئیتر هەر لە نزیکەوە دەستگیر دەکرێن و باڵبەست دەکرێن.

## چۆنت بەیانی کردەوە؟

ڕۆژێکیان عومەری کوڕی خەتاب تووشی حوزەیفەی کوڕی یەمانی هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ دەبێ، لێی دەپرسێ: حوزەیفە چۆنت بەیانی کردەوە؟ ئەویش دەڵێ: ئەی میری ئیمانداران وەها بەیانیم کردەوە: فیتنەم خۆشدەوێ و ڕقم لە هەق دەبێتەوە و شتێك دەڵێم کە خەلق نەکراوە و شایەتی بۆ شتێك دەدەم کە نەمبینیوە و بە بێ دەسنوێژ (صلاة ) نوێژ دەکەم و ئەوەی من لە زەوی هەمە خودا لە ئاسمان نیەتی..عومەر زۆر لەم قسانەی حوزەیفە تووڕە بوو و ویستی لێی بدات، بەڵام بیری کەوتەوە کە هاوەڵی پێغەمبەرە ﷺ بۆیە لێی نەدا..کەمێك دواتر عەلیی کوڕی ئەبوتالیب بەلایدا تێپەڕی بینی تووڕە دیارە، گوتی: ئەی میری ئیمانداران چ شتێك تووڕەی کردوویت، ئەویش چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە..عەلی گوتی: میری ئیمانداران تووڕە مەبە، ئەو قسەیەی کە گوتوویەتی فیتنەی خۆشدەوێ ئەوە لێکدانەوەی ئەم ئایەتەیە: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ﴾(الانفال: ٢٨)، ئەو قسەیەشی کە وتوویەتی: ڕقی لە هەقە ئەوە مەبەستی مردنە کە هەر دەبێ و لە دەستی قوتار نابین،

ئەو قسەیەشی کە گوتوویەتی: شتێك دەڵێ کە خەلق نەکراوە مەبەستی ئەوەیە قورئان دەخوێنێ و قورئانیش خەلق نەکراوە، هەروەها ئەوەشی کە گوتوویەتی شایەتی بۆ شتێك دەدات کە نەیبینیوە مەبەستی ئەوەیە بڕوای بە خودا هەیە و نەشیبینیوە، کە گوتووشیەتی بە بێ دەسنوێژ (صلاة) نوێژ دەکات مەبەستی ئەوە بووە بەبێ دەسنوێژ سەڵەوات لە دیداری پێغەمبەر دەدات، ئەو قسەیەشی کە گوتوویەتی ئەوەی ئەو لە زەوی هەیەتی خودا لە ئاسمان نیەتی مەبەستی لە هاوسەر و منداڵە کە ئەو هەیەتی و خودا نیەتی..

ئیمامی عومەر کە گوێی لەمانە بوو گوتی: ئەی باوکی حەسەن خودا بتپارێزێ بە ڕاستی خەمێکی گەورەت لە کۆڵ کردمەوە..

## هەڵاتن لە دونیا

دەگێڕدرێتەوە پیاوێکی دیمەشقی کە ناوی ئەبو عەبد ڕەبەیە و لە کەسە زۆر دەوڵەمەندەکانی دیمەشق بووە، بە مەبەستی بازرگانی گەشت دەکات، ئێوارە لادەداتە مێرگێکی دەم ڕووبارێك، تۆزێك لەولاتری خۆی، گوێی لە دەنگێك دەبێ کە زۆر سوپاس و ستایشی خودا دەکات، بە دوای دەنگەکەدا دەچێت دەبینێ پیاوێك لە پارچە حەسیرێك لوولدراوە! سەلامی لێ دەکات و پێی دەڵێ: کابرا تۆ

کێی؟ ئەویش دەڵێ: پیاوێکم لە موسڵمانان..پێی دەڵێ: ئەمە چییە ئەم حاڵەتە، بۆچی وات لێهاتووە؟ کابرا دەڵێ: نیعمەتێکە دەبێ شوکرانەی بکەم..بازرگان: چۆن؟! ئەتوو وا لە حەسیر لوولدراوی، ئەوە چ نیعمەتێکە؟! کابرا: نیعمەتەکە ئەوەیە: خودا بە جوانترین شێوە دروستی کردووم و لەدایکبوون و پێگەیشتنم لەناو ئیسلامدا بووە و ساغ و تەندروستم و ئەوەی کە من پێم خۆش نەبوو لەبارەمەوە باس بکرێ خودا بۆی داپۆشیوم، کێ لە من زیاتر نیعمەتی بەسەردا ڕژاوە؟! بازرگان: خودا ڕەحمەت پێ بکات دە هەستە وەرە کن ئێمە وا لەو مێرگە هەڵمانداوە..کابرا: بۆچی بێم؟ بازرگان: تاوەکو نانێك بخۆیت و جلکێکت بدەینێ لە کۆڵ ئەم حەسیرە ببیتەوە..کابرا ڕازی نەبوو لەگەڵی بچێت و گوتی: هیچ پێویستییەکم بەوانە نییە..

کابرای بازرگان دەڵێ: ڕۆیشتم و زۆر خۆم بە کەم هاتە بەرچاو و ڕقم لە خۆم بۆوە و لەبەر خۆمەوە گوتم: لە دیمەشق کەس لە من دەوڵەمەندتر نییە ئەوجا هێشتا بە دوای داراییی زیاترەوەم، گوتم: خودایە من تەوبە لەوە دەکەم کە تێیدامە و داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم..ئیتر هەر لەوێ تەوبەم کرد و هیچ کەسیش بەوەی منیان نەزانی..بەیانی کە خەڵك ڕۆیشتن من بڕیارمدا لەگەڵیان نەچم و

بگەڕێمەوە دیمەشق و چیرۆكەكەم بۆ باس كردن، زۆر سەرزەنشتیان كردم بەڵام من ڕازی نەبووم لەگەڵیان بڕۆم و گوتم: ئەگەر لە تەوبەكەم ڕاستگۆ بم نابێ بچمە ئەو بازرگانییەم..

چیرۆكخوێن دەڵێ: ئەم بازرگانە كە گەڕایەوە دیمەشق دەستیكرد بە بەخشینەوەی سەروەت و سامانەكەی لەپێناو خودا و تا مرد خەریكی خوداپەرستی بوو..كاتێ مرد تەنها پارەی كفنەكەی لە ماڵێدا هەبوو..

# بەشی بیست و چوار

## تۆبەكاران

هێی كابرا، ئەوا تۆبەكاران وەكو كەسێكی ترساو بەرەو پەرستگای خەڵوەت ڕادەكەن، چاویان هۆگری فرمێسك و گریان بووە، كڕنووشی زۆر هێڵی عیرفانی لە تەوێڵیان نەخشاندووە، لە شەوانی تاریكدا چەندە چالاكن! لە دۆڵی بەرەبەیاندا فرمێسكی چاوانیان لافاو دەكا! كاتێ نیشانەكانی بەرەبەیان دەردەكەون الله أكبر دەكەن لە خۆشییان، دەست دەكەن بە داوای لێخۆشبوون لە خوای خۆشەویستیان، هاوار دەكەن: خودایە ئیش و كار و كەس و ماڵ و منداڵمان بەجێهێشتووە، وازمان لە ئارەزووی نەفس و جەستە هێناوە، خانەی گەمە و گاڵتەمان لەمێژە وێران كردووە و زەمانێكە چۆڵ بووە، دونیامان بەیەكجاری تەڵاق داوە و ماڵ و دانیشتوانەكەیمان بەجێهێشتووە، لە شەڕابی هاودەمیی تۆ قومێكمان دراوەتێ بۆیە وا شەیدا و عاشق بووین.

ئەم تۆبەكارانە بەرگی برسێتییان پۆشیوە و خزمەتكردنی بەڕێز و بێڕێزیان تەرك كردووە، دڵەكانیان بە تەقوا و زیكر ئاوەدان كردۆتەوە، سەرمەستی خۆشەویستیی خودا بوونە و لە عەشقدا تواونەتەوە..ئارەزووەكانی نەفسیان بە كەمترین نرخ فرۆشتووە و

لەپێناو خوادا ترس و بێخەوی سیسی کردوون..بە قەزا و قەدەری خودا ڕەزامەند بوون و بە دەنگی خۆش و خەمبارەوە قورئان دەخوێنن﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾(السجدة: ١٦) واتە: (ئەو ئیماندارە بەختەوەرانە) نێوانیان خۆش نییە لەگەڵ ڕاکشان لە جێگەو ڕێگەو ڕێگەی گەرم و نەرمدا (واتە: بەنوێژ و خواپەرستی بەشێکی شەو دەبەنە سەر)، هەمیشە نزاو پاڕانەوەیان ڕوو بە پەروەردگاریانە لە خەشم و قین و دۆزەخی دەترسن، ئاواتی ڕەزامەندی و بەهەشتیان هەیە.

## ئەی لاوەکان

ئەی لاوەکان، ژیانی کەسە ڕاستگۆ و بۆ خوا سوڵحاوەکان چەندە خۆشە! ئەم شەڕابی عەشقەیان نۆشیوە و نهێنیی بەختەوەرییان دۆزیوەتەوە، خودای خۆشەویستیان کە لە دڵیان خۆی پیشانداون ئیتر پێویستیان بەوە نەماوە بە چاوی سەر ببینن، بە زمانێکی نەرم دەیانلاوێنێتەوە ﴿يَا عِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ وَلَا أَنْتُمْ تَحْزَنُونَ﴾(الزخرف: ٦٨) واتە: ئەی بەندەکانم ئەمڕۆ ئیتر ئێوە هیچ ترس و بیمێکتان نابێت وهیچ غەم و پەژارەیەك ڕووتان تێ ناکات...

ئێــوه ئــەمانتان بــۆ هەیــە، لــەپێناو منــدا چــەندە بەرگــەی ناخۆشــیتان گــرت و چــەندە شــەونخونیتان کــرد! چــەندە دڵ و دەروونتان پڕ بوو لە شەوق بۆ دیداری مـن! ئـیتر لـە دوارۆژدا ڕووی خۆمتان پیشان دەدەم و لە شتی وەها بەهرەمەندتان دەکەم کە بە خەیاڵی هیچ کەسێکدا نەهاتبێ! پۆشاکی ڕەزامەندیتان لەبەردەکەم و مەجلیســەکانتان بــە خۆشــنوودی ڕایەخڕێــژ دەکــەم و شــەڕابی بێگەردی یەکتاپەرستیتان پێ دەنۆشم..

ئەمە بانگەوازی خودای گەورەیــە، کـوان ئەوانـەی پەرۆشـی ئـەم شەڕابەن، ئەمە جامی لێوانلێوی تەوبەیە وەرن نۆشی بکەن.

ئەی ئەو کەسەی لە بێفەرمانیدا تەمەنی خۆت بەفیڕۆ داوە

تــۆ لــە کــوێی ئــەهلی دڵ و ســەفایت: ئــەی ئــەو کەســەی لــە بێفەرمانیــدا تەمــەنی خــۆت بــەفیڕۆ داوە، هــەنگاو هەڵێنــە و وەرە پێشەوە، با چیتر زەرەرمەند و داماو نەبیت، بە گـوێی ئـەو کەسانە مەکــە کــە لەســەر گرتنەبــەری ڕێــی خــودا سەرزەنشــتت دەکــەن، پێچەوانەی قسەی ئەوان ڕاستەڕێی خواپەرستی بگرە و بە گوێی ئەو کەسانە بکە کە ئامۆژگاریی باشت دەکەن و واز لە گوتیـان و دەڵـێن بێنە ﴿فَمَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَأُولَـئِكَ يَقْـرَءُونَ كِتَـابَهُمْ وَلَـا يُظْلَمُـونَ فَتِيلًا(٧١) وَمَنْ كَـانَ فِـي هَـذِهِ أَعْمَـى فَهُـوَ فِـي الْـآخِرَةِ أَعْمَـى وَأَضَـلُّ

سَبِيلًا﴾(الاسراء: ٧١ – ٧٢) واتە: جا ئەوەی نامەو دۆسیەی کردەوەکانی بدرێتە دەستی ڕاستی، ئەوانە (بەخۆشییەوە) سەیری نامەی کردەوەکانی خۆیان دەکەن و دەیخوێننەوە و بەقەدەر تاڵە باریکەکەی ناوکی خورما ستەمیان لێ ناکرێت (کە شتێکی بێ نرخە)..جا ئەوەی لەم دنیایەدا (دڵ و دەروون و بیرو هۆشی) کوێر بێت، ئەوە لە قیامەتدا چاوی کوێرەو زۆر سەرگەردانترو سەرلێشێواوترە، چونکە چاوی سەری بۆ بینایی و تێفکران بەکار نەهێناوە لە دنیادا.

# بەشی بیست و پێنج

## داوێنپیسی لە تاوانە هەرە گەورەکانە

بزانە کە داوێنپیسی(زینا) لە تاوانە هەرە گەورەکانە و نەگبەتییە بۆ ئەو کەسەی دەیکات و لە دونیا و قیامەت تووشی چەرمەسەری دەبێت، خودای گەورە لە زۆر شوێنی قورئاندا نەهی لێ کردووە: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا﴾(الاسراء: ٣٢) واتە: هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیك ببنەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناه و تاوان و هەڵە و ڕێچکەیەکی زۆر ناقۆڵایە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ (٥) إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ(٦)فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ(٧)﴾(المؤمنون: ٥ — ٧) واتە: ئەوانەش کە پارێزەری داوێنی خۆیانن، جگە لەگەڵ هاوسەران و کەنیزەکەکانیاندا نەبێت، کە ئەوە جێگەی لۆمەو سەر زەنشت نییە..جا ئەوەی جگە لەو سنوورە دیاری کراوە، ڕێگەو ڕێبازی تر بگرێتەبەر، ئەو جۆرە کەسانە بە یاخی و لە سنوور دەرچوو دەژمێردرێن.

هـەروەها پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: (ئـەو کاتـەی زیناکـەر زینـا دەکات ئیمانـدار نییـە)حـدیث صـحیح: رواه البخـاری و مسلم و أبـو داود. مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە کە زیناکەر دوورە لە خودا و شیاوی خەشم و قینی خودایە.

هەروەها گێڕدراوەتەوە کە گەنجێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی گـوت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ڕێـم پـێ دەدەی زینـا بکـەم؟ خـەڵك لەسـەریان کـردە هاتوهـاوار، پێغەمبـەریش ﷺ فـەرمووی: وازی لێ بێـنن، لـێم نزیـك بـەوە، ئـەویش لێـی نزیـك بۆوە..فـەرمووی: حەزدەکـەیت زینـا لەگـەڵ داکـت بکـرێ؟ گـوتی: نا..فـەرمووی: خەڵکیش ئەوها حەز ناکەن زینا لەگەڵ دایك و کچیان بکـرێ....ئیتر پێغەمبـەر لـەبارەی زۆربـەی خزمـەکانی پرسـیاری لێ کـرد، ئـەویش دەیگـوت: نا..پێغەمبـەریش ﷺ دەیفـەرموو: خـەڵکیش حـەز ناکـەن زینا لەگەڵ کەسوکاریان بکرێ..پاشان پێغەمبەر ﷺ دەستی خستە سەر سینگی و فـەرمووی: (خودایـە دڵـی پـاك بکـەوە، لـە گونـاهی خۆشبە، داوێنی بپارێزە.)..دوای ئەم دوعایەی پێغەمبەر هیچ شتێك هێندەی زینا لە لای بێزراو نەبوو.)حدیث صحیح: رواه الامام أحمد.

هـەروەها پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: (هـیچ کـەس هێنـدەی خـوا تووڕە نابێ و غـیرە نـایگرێ کـاتێ دەبینـێ پیاوێك یـان ژنێك زینـا

دەكات، ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیبایە كەم پێدەكەنین و زۆر دەگریان.) حدیث صحیح: رواه البخاری و مسلم و أحمد و النسائي و مالك و البیهقي.

لوقمانی حەكیم بە كوڕەكەی دەگوت: نەكەی توخنی زینا بكەویت چونكە سەرەتاكەی ترسە و كۆتاییەكەی پەشیمانییە، لە قیامەتیش سزاكەی وەردەگریت.

# بەشی بیست و شەش

## گەورەییی بێدەنگی

گێڕدراوەتـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ سـۆراغی کـەعبی کـردووە کـە بۆچـی دیـار نییـە؟ گوتیـان: نەخۆشـە..ئەویش سـەردانی کـرد، کـە چووە کنی گوتی: ئەی کعب مزگێنیت لێ بێت..دایکی گوتی: کـەعب بەهەشتت لێ پیرۆز بێت..پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئـەوە کێیـە بـە نـاوی خـــوداوە بڕیـــار دەدات؟ کـــەعب گـــوتی: دایکمە..پێغەمبـــەر ﷺ فەرمووی: دایکی کەعب تـۆ چـووزانیت، لەوانەیـە کـەعب قسـەیەکی کردبێت پەیوەندی بەمەوە نەبووبێت یان شتێکی مەنع کردبێـت کـە هیچ پێویستی و نیازێکی پێ نەبووە.) حدیث حسن..

گوتراوە: حەزرەتی مەریەمی دایکی عیسای مەسیح کاتێ نـەزری کرد لەپێناو خودا قسە نـەکات و زمـانی گـرت، لـە بەرانبـەر ئـەوەدا خودای گەورە زمانی مندالەکەی کردەوە..

هەرکەسێك لەپێناو خودا لە دونیا زمانی بپـارێزێ ئـەوا لـە کـاتی مردن و دیداری پەروەردگاردا، خودا زمانی بە شایەتمان دەکاتـەوە، هــەر کەسـێکیش زمــانی بەربداتــە ئــابرووی موسـڵمانان و شـوێن

عەیبوعاریان بکەوێت ئەوا خودا لە کاتی مردن زمانی لە شایەتمان دەبەستێ.

موعاز لە پێغەمبەری ﷺ پرسی: باشترین کردەوە چییە؟ پێغەمبەر زمانی دەرهێنا و دەستی لەسەر دانا.)حدیث حسن..

لە (صحف)ی ئیبراهیمدا هاتووە: لەسەر کەسی ژیر پێویستە ئاگاداری سەردەمەکەی بێت و بایەخ بە کاروباری خۆی بدات و زمانی بپارێزێ.

مالکی کوڕی دینار دەڵێ: ئەگەر هەستت بە دڵڕەقییەك، یان لاوازییەکی جەستە، یان ڕۆزی تەنگییەك کرد ئەوا بزانە قسەیەکی بێسوودت کردووە.

لوقمانی حەکیم بە کوڕەکەی گوت: کوڕەکەم، هەر کەس ڕەحم بە خەڵك بکات ڕەحمی پێ دەکرێ، هەر کەس بێدەنگ بێت سەلامەت دەبێ، هەر کەس خێر بکات پاداشتی دەست دەکەوێ، هەر کەس خراپە بکات سزا دەدرێ، هەر کەس ئاگای لە زمانی نەبێ پەشیمان دەبێتەوە.

هەندێ دانا گوتوویانە: وازهێنان لە قسەی زیاد دەربڕینی حیکمەتی لێ وەبەرهەم دێ، وازهێنان لە تەماشاکردنی بێسوود ترس

و خشوعی بەدوادا دێ، وازهێنان لە زۆرخۆری شیرنایی خواپەرستی لێ دەکەوێتەوە، وازهێنان لە پێکەنین سام و شکۆی لێ بەرهەم دێت، وازهێنان لە حەرام بەهەشتی بەدواوەیە، وازهێنان لە سیخوڕی و بەدواداچوونی عەیبی خەڵك چاکبوونی عەیبەکانی خۆتی لێ وەپاش دەکەوێ..

## بەدوای نەنگییەکانی خەڵکدا مەگەڕێن

بزانە سیخوڕیکردن و بەدواداچوونی کەمایەسی و عەیبەکانی خەڵك کارێکی نەشیاوە و دەبێتە هۆی دەرکەوتنی کەموکورتییەکانی خۆت، خودای گەورە نەهی لەم ڕەوشتە ناشیرینە کردووە: ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا﴾(الحجرات: ١٢) واتە: بەشوێن کەموکوڕیی و عەیب و عاری یەکتردا مەگەڕێن و سیخوڕی مەکەن و لەپاشملە باسی یەکتری بەخراپ مەکەن..

لە خوا بترسە و واز لە عەیبوعاری خەڵك بێنە و بە عەیبەکانی خۆتەوە سەرقاڵ بە، وەکو مێش مەبە کە ڕقی لە پاکەکانە و هەمیشە بە شوێنی پیسەوە دەنیشێتەوە..هەر کەسێك بە دوای کەموکورتییەکانی خەڵکەوە بگەڕێ و واز لە عەیبەکانی خۆی بێنێ ئەوا خودا کەسێکیش بۆ ئەو پەیدا دەکات کە بە دوای نەنگی و

كەمایەسییەكانیدا بگەڕێ و كەشفی بكات و بڵاوی بكاتەوە و حەیای ببات..

ژیری بەختەوەر كەسێكە لە عەیبی خۆی بڕوانێ و ئەوەش لە عەیبوعاری خەڵك و هەموو شتێك مەشغولی بكات تەنها خودا نەبێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هەر كەسێك چاوپۆشی لە كەموكورتییەكی موسڵمانێك بكات خودا لە ڕۆژی دوایی چاوپۆشی لە كەموكورتییەكانی دەكات.) حدیث صحیح: رواه أبو داود و ابن ماجة و البیهقی و ابن حبان.

## ئەبو حەنیفە و مەیخۆرێك

دەگێڕنەوە ئەبو حەنیفە دراوسێیەكی لاوی مەیخۆری هەبووە، كە لە نێوان ئەم و ئەودا تەنها دیوارێك هەبووە، شەوان ئەبو حەنیفە خەریكی خوێندنەوە و زانست دەبوو، لاوەكەش سەرگەرمی مەیخۆری دەبوو و ئەم دێڕە شیعرەی زۆر دووبارە دەكردەوە:

سأنشدهم إذا ما هم جفوني    أضاعوني و أي فتى أضاعوا

شیعریان بۆ دەڵێم، ئەگەر پشتیان تێكردم ئەوا لە دەستمدەدەن، ئای ئەو كات چ لاوێكیان لەدەستدەچێت؟!

ئەبو حەنیفە هۆگری قسەکانی ببوو، شەوێکیان ئەبو حەنیفە گوێی لە قسەکانی نەبوو، کاتێ بەیانی چووە نوێژ لەبارەیەوە پرسیاری کرد، گوتیان: دوێنێ پۆلیس بە سەرخۆشی گرتوویانە و خستویانەتە بەندیخانەوە..ئەبو حەنیفە دوای نوێژ بە خۆی هەستا چووە ماڵی بەڕێوەبەری پۆلیس و خۆی بە دەرگاوانەکە ناساند و داوای بینینی بەڕێوەبەری پۆلیسی کرد، بەڕێوەبەر کە ناوی ئەبو حەنیفەی بیست بە پێخواسی و سەرکۆتییەوە بە پیرییەوە چوو و دەستەکانی ماچ کرد و گوتی: گەورەم ئەمن چمە ئەتوو بەو گەورەییەی خۆت بێیتە ماڵی من!..ئەبو حەنیفە گوتی: من بۆ کێشەی دراوسێیەکم هاتووم کە دوێنێ بەندتان کردووە. بەڕێوەبەر گوتی: ئەوا شایەت بە من لەبەر خاتری هاتنی تۆ هەموو بەندییەکانی ئەو بەندیخانەیە ئازاد دەکەم.

ئەبو حەنیفە کاتێ گەڕایەوە ماڵ بینی گەنجەکە ئازاد کراوە..گەنجەکە پرسی: کێ هەوڵی ئازادکردنی منی دا؟ گوتیان: ئەبو حەنیفە..گوتی: من بەردەوام بە شەونخونی و قسەکانم ئازاری ویم داوە...هەستا چووە ماڵی ئەبو حەنیفە، کاتێ لەبەردەمی وەستا ئەبو حەنیفە گوتی: ئەی گەنج ئێمە پشتگوێمان نەخستیت، بۆیەش هەوڵی ئازادکردنمان دایت چونکە ڕەچاوی ئەو قسەیەتمان

كـــردووە كـــە هەمیشـــە دەتكـــوت: (أضـــاعوني و أي فتـــى أضاعوا)..لاوەكە كوتی: گەورەم شایەت بە ئـەوا مـن لەبـەر خـاتری خـودا تەوبـەم كـرد..ئیتر بـووە هـاوڕێی ئـەبو حەنیفـە و تـا مـرد سەرگەرمی خواپەرستی بوو.

# بەشی بیست و حەوت

## زەمکردنی غەیبەت و دووزمانی

بزانە: دووزمانی، دین و دونیا تێکدەدات و دڵەکان دەگۆڕێ و ڕق و کینە و خوێنڕشتن و پەرتەوازەیی دەخاتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَهِينٍ (١٠) هَمَّازٍ مَشَّاءٍ بِنَمِيمٍ (١١) مَنَّاعٍ لِلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ (١٢) عُتُلٍّ بَعْدَ ذَلِكَ زَنِيمٍ(١٣)﴾(القلم: ١٠–١٣) واتە: بەقسەی هەموو ئەوانە مەکە کە زۆر سوێند دەخۆن و زۆر سووك و ڕیسوان. ئەوانەی کە بەشوێن عەیب و عاردا دەگەڕێن و دووزمانی دەکەن و فیتنە دەگێڕن و حەزیان لە ئاشووبە. زۆر دژی خێرو چاکەن و دەستدرێژی دەکەن و گوناه ئەنجام دەدەن و پیلان دەگێڕن. لە هەمانکاتدا ئێسك تاڵ و ڕەوشت ناشرین و ناکەس بەچەو باوك نادیارن..

لە بارەی غەیبەتەوە لە پێغەمبەریان ﷺ پرسی کە چییە؟ فەرمووی: غەیبەت ئەوەیە لە غیابی براکەت باسی شتێکی بکەیت کە تێیدایە، ئەگەر باسی شتێکیشی بکەیت کە تێیدا نییە ئەوا بوختانت بۆی کردووە.) حدیث صحیح: رواه مسلم و الترمذی و أحمد و أبو داود و البیهقی و الدارمی.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (کەسی دووزمان ناچێتە بەهەشتەوە.) حدیث صحیح: رواه البخاری و مسلم.

حاتیمی ئەسەم دەڵێ: ئەگەر سێ شت لە مەجلیسەکەم هەبوون ئەوا ڕەحمەت لەو مەجلیسە دوورە: باسکردنی دونیا و پێکەنین و زەمکردنی خەڵك.

گوتراوە: غەیبەتکار وەکو ئەو کەسە وایە کە لەسەر ئامێری مەنجەنیقە، چاکەکانی بۆ خەڵك دەهاوێ.

دانایان گوتوویانە: دووزمانی دەبێتە هۆی ڕق و کینەی دڵەکان و هەر کەسێکیش قسەی خەڵك بۆ تۆ بێنێ قسەی تۆش بۆ خەڵك دەبات..

## ئامۆژگارییەکی بەنرخی ژنە دەشتەکییەك

ئەسمەعی دەڵێ: ژنە دەشتەکییەکم بینی ئامۆژگاریی کوڕەکەی دەکرد و دەیگوت: پشتیوان بە خوا ئامۆژگاریی خۆمت پێشکەش دەکەم، وریا بە نەکەی دووزمانی بکەیت چونکە دووزمانی دەبێتە هۆی دوژمنایەتی نێوان کەسوکار و دابڕاندنی خۆشەویستان لە یەکتر، نەکەی بەدوای عەیبوعاری خەڵکدا بگەڕێیت چونکە دواتر بەسەر خۆتدا دەشکێتەوە، نەکەی بە ئایینەکەت سەخی و بە

ماڵەکەت قرچۆك بێت، خەڵکی بۆ خۆت بکە بە نموونە: ئەو ڕەوشتەی لەوان پێت جوان بوو بیکە، ئەوەشی لە کنت ناشیرین بوو لێی دوورکەوە، چونکە مرۆڤ عەیبی خۆی نابینێ..

کوڕەکەم وریابە نەکەی وەفا بشکێنیت و ستەم بکەیت چونکە ئەوە ناشیرینترین ڕەفتارێکە بەرامبەر خەڵکی بکەیت، چاوتێری و زانست و خاکەڕایی و حەیا بکە بە ڕەوشتی خۆت و لە خۆتیاندا کۆبکەوە..

# بەشی بیست و هەشت

## وریای غەیبەتكردنی دڵ بە

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (خودای گەورە خوێن و ماڵی موسڵمان و گومان پێبردنی خراپی حەرام كردووە.)

غەیبەتكردن بە دڵ هەروەكو غەیبەتكردن بە زمان حەرامە مەگەر بۆ ناسین و ناساندن بێت كە ناكرێ پشتگوێ بخرێ.

سنوری غەیبەت ئەوەیە كـە پێغەمبـەر ﷺ ڕوونـی كردۆتـەوە كـە بریتییە لە باسكردنی براكەت بە جۆرێك ئەو پێی نـاخۆش بێـت جا گـوێی لێ بێـت یـان پێـی بگاتـەوە تەنانـەت ئەگـەر ئـەو قسـەیەی لەبارەشـــیەوە دەیكـــەیت ڕاســـت بێت..جـــا ئـــەو باســـكردنە كەموكورتییـەك بێـت لـە خـۆی، یـان لـە عـەقڵی، یـان بـەرگی، یـان كردەوەكـانی، یـــان قســـەكانی، یـــان دینـــی، یـــان مـــاڵی، یـــان سـوارییەكەی، یـان منـداڵی، یـان خێزانـی، یـان هـەر شـتێك كـە پەیوەست بێت بەوەوە..

عائیشە بە دەست وەسفی سەفییەی كرد كە مەبەستی ئەوە بوو بـەژنی كورتـە، پێغەمبـەر ﷺ پێـی فـەرموو: عائیشـە غەیبـەتت

کرد..عائیشە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی کورت نییە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ باسی ناشیرینترین شتی ئەوت کرد.

غەیبەت تەنها پەیوەست نییە بە زمانەوە، بەڵکو هەر شتێك کە واتایەك ببەخشێ و خەڵك لێی تێ بگات و باسکراوەکە پێی ناخۆش بێت جا گوێی لێ بێت یان پێی بگاتەوە، جا بە دەست بێت یان قاچ یان ئاماژە یان جووڵە یان لاساییکردنەوە، هەموو ئەمانە غەیبەتن..خوای گەورە غەیبەتی زۆر بە تاوانێکی گەورە داناوە، فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ﴾(الحجرات: ١٢) واتە: لە پاشملەباسی یەکتری بەخراپ مەکەن، ئایا کەستان خۆشی دێت لەوەی گۆشتی برای خۆی بەمردوویی بخوات؟!

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَيْلٌ لِكُلِّ هُمَزَةٍ لُمَزَةٍ﴾(الهمزة: ١) واتە: هاوار و ئاهو ناڵە بۆ هەر کەسێك کە بە شوێن کەم و کورتیدا دەگەڕێت و لە عەیب و عاری خەڵکی دەدوێت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (لەو شەوەی شەورەویم پێکرا بە لای هەندێ خەڵکدا تێپەڕیم بە نینۆکەکانیان دەموچاوی خۆیان دەڕنییەوە، گوتم: جیبریل ئەمانە کێن؟ گوتی: ئەمانە ئەو کەسانەن کە غەیبەتی خەڵك دەکەن) حدیث صحیح: رواه الامام أحمد و ابو داود.

# بەشی بیست و نۆ

## ئازارنەدانی موسڵمانان

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (موسڵمانی ڕاستەقینە ئەو كەسەیە كە موسڵمانان لە دەست و زمانی بێوەی بن) حدیث صحیح: رواه البخاری و مسلم.

هەروەها دەفەرموێ: (موسڵمان برای موسڵمانە، ستەمی لێ ناكات و تەسلیمی دوژمنانی ناكات) حدیث صحیح: رواه بخاری و مسلم.

هەروەها فەرموویەتی: (ئیمانداران وەكو یەك پیاو وان، ئەگەر سەری ژانی كرد هەموو لەشی تووشی تا دێت و خەوی لێ ناكەوێ.) حدیث صحیح: رواه مسلم و أحمد.

## چاكەی بێدەنگی

موعازی كوڕی جەبەل بە پێغەمبەر ﷺ گوت: ئەی پێغەمبەر خوا لەسەر ئەو قسانەی دەیانكەین سزا دەدرێین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەی كوڕی جبل دایكت پڕپڕۆت بۆ بكات، ئەدی خەڵك هەر بە هۆی قسە و زمانیان نییە لە ڕۆژی دوایی لەسەر ڕوویان ڕادەكێشرێن؟!) حدیث صحیح: رواه الترمذی و ابن ماجه و أحمد.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هەر کەسێك باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با قسەیەکی خێر بکات یان بێدەنگ بێت.) حدیث صحیح: رواه البخاری و مسلم.

هەروەها فەرموویەتی: (زۆربەی تاوان و هەڵەکانی بنیادەم لە زمانیەوەیەتی.)حدیث حسن.

هەروەها فەرموویەتی: (جاری وا هەیە مرۆڤ قسەیەك لە ڕەزامەندیی خودا دەکات پێی وا نییە ئەوەندە گرینگ بێت کەچی لای خوا گەورە زۆر گرینگە و تا ڕۆژی قیامەت ڕەزامەندیی خۆی بۆ دەنووسێ.) حدیث صحیح: رواه أحمد و الترمذی و ابن ماجة و مالك و ابن حبان و الحاکم. هەروەها دەفەرموێ: (جاری وا هەیە مرۆڤ قسەیەك دەکات کە زۆر گوێی پێ نادات بەڵام خودای گەورە بەم قسەیە بەرەو بەهەشت بەرزی دەکاتەوە.) حدیث صحیح: رواه البخاری و مالك.

## وریای خودپەسندی بە

براکەم، وریای خودپەسندی و بەخۆنازین بە، چونکە ئەمە ڕەوشتێکی زەمکراو و بێزراوە، جا بە نەفس بێت یان کردەوە یان قسە، بە قسە و کردەوەی خۆت هەڵمەخەڵەتێ، خوای گەورە

دەفەرموێت: ﴿فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى﴾(النجم: ٣٢) واتە: خۆتان بە چاك مەزانن، هەر خوا خۆی دەزانێ كێ تەقوای هەیە و پارێزكارە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (سێ شت لەناوبەرن: دەسقوچاوی و قرچۆكی، ئارەزووبازی، خودپەسندی و بەخۆنازین.) حديث حسن..

هەروەها دەفەرموێ: (ئەگەر تاوانتان نەكردبایە لە شتێكی لە تاوان مەترسیدارتر لێتان دەترسام ئەویش: خودپەسندییە.) حديث حسن.

لە عائیشەیان پرسی: كەی مرۆڤ بەدكار دەبێ؟ گوتی: ئەگەر وا گومانی برد كە چاكەكارە.

ئیبنو عەباس دەڵێ: لەناوچوون لە دوو شتدایە: بێهیوایی و خودپەسندی..

كەسی بێهیوا لەبەر بێئومێدبوونی هەوڵی بەختەوەری نادات، خودپەسندیش هەوڵی بۆ نادات چونكە پێی وایە بەدەستی هێناوە..

دەگێڕنەوە پیاوێك تەماشای بیشری كوڕی منەسووری حافیی دەكرد كە نوێژی درێژ دەكردەوە و خواپەرستی بەجوانی دەكرد، كاتێ بشر لێ بۆوە پێی گوت: ئەوەی لە منت بینی فریوت نەدا،

ئیبلیس نەفرەتی خوای لێ بێت هەزاران ساڵ خوای پەرست دواتر چی بەسەرهات و چارەنووسی چی بوو!.

بەختەوەریی مرۆڤ لەوەدایە ددان بە کەمتەرخەمیی خۆی لە قسە و کردەوەدا بنێ.

عەبدوڵڵا کوڕی مسعود گوتوویەتی: گەورەترین تاوان درۆیە و جوێندان بە موسڵمان لادانە لە دین، شەڕکردن لەگەڵیشی کوفرە، حورمەتی ماڵیشی وەکو حورمەتی خوێنی وایە کە هەردووکیان حەرامن، هەر کەسێك لە هەوڵی پاکداوێنیدا بێت خوای گەورە پاکی رادەگرێ، هەر کەس رِق و تووڕەیی خۆی بخواتەوە پاداشتی دەدرێتەوە، هەر کەس لێبووردە بێت خوداش لێی دەبووری، هەر کەس لەسەر بەڵا و موسیبەت ئارام بگرێ خوای گەورە بە باشتر بۆی قەرەبوو دەکاتەوە.

## گەورەیی لێبووردەیی

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هیچ شتێك لەوە لای خودا خۆشەویستتر نییە کە کەسێك تووڕەیی خۆی بخواتەوە، هەر کەسێك تووڕەیی خۆی بخواتەوە و بشتوانێ تووڕەییەکەی

جێبەجێ بكات ئەوا خودا دڵی پڕ دەكات لە ئارامی و ئیمان.)حدیث صحیح..

دەگێڕنەوە: غوڵامێكی جەعفەروسادق ئاوی بە دەستیدا دەكرد هەندێ ئاو بەر جلوبەرگەكانی كەوت، جەعفەر بە چاوێكی ناڕەزاییانەوە تەماشای كرد، غوڵامەكە گوتی: ئاغام خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ ﴾، گوتی: ئەوا تووڕەیی خۆم خواردەوە، غوڵامەكە گوتی: ﴿وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ﴾، گوتی: ئەوا لێت خۆشبووم..غوڵامەكە گوتی: ﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾، گوتی: بڕۆ ئەوا تۆ لەپێناو خودا ئازادیت و هەزار دیناریشت دەدەمێ.

## هەڵگری قورئان

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ، قَالَ " : يَنْبَغِي لِحَامِلِ الْقُرْآنِ أَنْ يُعْرَفَ بِلَيْلِهِ إِذَا النَّاسُ نَائِمُونَ ، وَبِنَهَارِهِ إِذَا النَّاسُ مُفْطِرُونَ ، وبِحُزْنِهِ إِذَا النَّاسُ يَفْرَحُونَ ، وَبِبُكَائِهِ إِذَا النَّاسُ يَضْحَكُونَ ، وبِصَمْتِهِ إِذَا النَّاسُ يُخْطِئُونَ ، وَبِخُشُوعِهِ إِذَا النَّاسُ يَخْتَالُونَ ، وَيَنْبَغِي لِحَامِلِ الْقُرْآنِ أَنْ يَكُونَ بَاكِيًا مَحْزُونًا حَلِيمًا سَكِينًا ، وَلا يَنْبَغِي لِحَامِلِ الْقُرْآنِ أَنْ يَكُونَ جَافِيًا ، وَلا غَافِلا ، وَلا صخابًا ، وَلا ضاحكًا ، وَلا حديدًا. "

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود دەڵێ: پێویستە هەڵگری قورئان بە شەوبێداری ئەو کاتەی خەڵك نووستوون، بە گریانی ئەو کاتەی خەڵك پێدەکەنن، بە بێدەنگبوونی ئەو کاتەی خەڵك قسەی هەلەق و مەلەق دەکەن، بە سەرکزی و ملکەچی ئەو کاتەی خەڵك خۆبەزلزان و بەفیزن بناسرێ. پێویستە هەڵگری قورئان چاوبەفرمێسك و خەمبار، لەسەرخۆ و ئارام بێت، نابێ هەڵگری قورئان وشك و بێئاگا و بە هاتوهاوار و دەنگبەرز و تووڕە و دەم بە قاقا توندوتیژ بێت.

# بەشی سێ

## سووخۆری

بزانە، سووخۆری(ڕیبا) لە تاوانە لەناوبەرەکانە، کەمترین سوو وەکو ئەوە وایە لەگەڵ دایکت زینا بکەیت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾(البقرة: ٢٧٨) واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پارێزکار و خواناس بن و واز لە پاشماوەی سوو بهێنن ئەگەر ئیماندارن.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا فَمَنْ جَاءَهُ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّهِ فَانْتَهَى فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾(البقرة: ١٧٥) واتە: ئەوانەی سوو دەخۆن، هەڵسوکەوت ناکەن و ڕاست نابنەوە (لە گۆڕدا) مەگەر وەك ئەو کەسەی کە شەیتان دەستی لێوەشاندبێت (هەر لە دنیادا سروشتی نین، لە قیامەتیشدا وەك شێت دەبن) چونکە ئەوانە دەڵێن: کڕین و فرۆشتن وەك سوو وایە (لە حاڵێکدا): خوا کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە و سووی حەرام کردووە، جا ئەوەی ئامۆژگاری پەروەردگاری

پێگەیشت و وازی هێنا، ئەوەی دەستی کەوتووە بۆ خۆی، کاری (لە لێ پرسینەوەشی) دەکەوێتەلای خوا، بەڵام ئەوەی دەست بکاتەوە بەسووخۆری، ئا ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیادا دەبەنەسەر.

ففي حديث سمرة رضي الله عنه قَالَ : ( فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى نَهَرٍ أَحْمَرَ مِثْلِ الدَّمِ ، وَإِذَا فِي النَّهَرِ رَجُلٌ سَابِحٌ يَسْبَحُ ، وَإِذَا عَلَى شَطِّ النَّهَرِ رَجُلٌ قَدْ جَمَعَ عِنْدَهُ حِجَارَةً كَثِيرَةً ، وَإِذَا ذَلِكَ السَّابِحُ يَسْبَحُ مَا يَسْبَحُ ثُمَّ يَأْتِي ذَلِكَ الَّذِي قَدْ جَمَعَ عِنْدَهُ الْحِجَارَةَ فَيَفْغَرُ لَهُ فَاهُ فَيُلْقِمُهُ حَجَرًا فَيَنْطَلِقُ يَسْبَحُ ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَيْهِ كُلَّمَا رجعَ إِلَيْهِ فَغَرَ لَهُ فَاهُ فَأَلْقَمَهُ حَجَرًا ) إلى أن قال : ( وَأَمَّا الرَّجُلُ الَّذِي أَتَيْتَ عَلَيْهِ يَسْبَحُ فِي النَّهَرِ وَيُلْقَمُ الْحَجَرَ فَإِنَّهُ آكِلُ الرِّبَا). رواه البخاري.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (لەو شەوەی شەورەویم پێکرا بە لای ڕووبارێکی خوێندا تێپەڕین، پیاوێکی تێدا بوو، پیاوێکیش لەسەر لێوارەکەی وەستا بوو و کۆمەڵێك بەردیشی لە لا بوو، ئەو پیاوەی ناو ڕووبارە خوێنەکە هەر کات بیویستایە بێتەدەرێ پیاوەکەی سەر لێوارەکە بەردێکی لەناو دەمی دەدا و دەیگەڕاندەوە ناو ڕووبارە خوێنەکە...پرسیارم لەبارەی ئەم پیاوەوە کرد، گوتیان: ئەمە سووخۆرە تا ڕۆژی قیامەت هەر وەهای لێ دەکرێ .

خـوای گـەورە داوامـان لێ دەكـات هـەر شـتێك حـەڵاڵ نـەبوو نەیخۆین، لـەمبارەوە دەفـەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُوا مِمَّا فِي الْأَرْضِ حَلَالًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾(البقرة: ١٦٨) واتە: ئەی خەڵكینە ! لە ڕزق و ڕۆزی حەڵاڵ و پـاكی زەوی بخـۆن (تـوخنی قەدەغـە كراوەكـان مەكـەون) و شـوێن هـەنگاوەكانی شـەیتان مەكـەون، چـونكە بێگومـان ئـەو دوژمنێكـی ئاشكراتانە.

## حەرام بینایی كوێر دەكات

سوفیانی كوڕی عویەینـە دەڵـێ: ئایـەتێكم دەخوێنـدەوە حـەفتا بابەتی زانستم لێوە بۆ دەهات، بەڵام كاتێ نانی ئەو میرانەم خـوارد وام لێهات ئایەتێكم دەخوێنـدەوە یـەك بابـەتی زانستیشـم لێـوە بـۆ نەدەهات.

نـانی حـەرام پیـوی بـیر دەتوێنێتـەوە و چـێژی شـیرینیی زیكـر دەبات و بەرگی دڵسۆزی دەسووتێنێ، هەر لە حەرام كوێرایی بینایی و تاریكاییی ناخ دێتەبوون. ماڵێكی حەڵاڵ بەدەست بێنە و خـەرجی بكە، لە حـەرام و حـەرامخۆران دووربكـەوە و لەگـەڵیان دامەنیشـە و خواردنیـان مـەخۆ و هاوڕێیـەتی كەسـانێك مەكـە كـە ئیشـوكاریان حەرامە. بە حـەرام میوانـداریی كـەس مەكـە، ئـەو نانەكـە بخـوات و

تۆش لێپرسینەوەت لەگەڵدا بکرێ، یارمەتی کەس مەدە بۆ دەسکەوتی حەرام چونکە تۆش دەبیتە هاوبەشی ئەو حەرامە، بزانە کە کار و کردەوەی ئەو کەسانە وەردەگیرێ کە خواردنیان حەڵاڵە.

## وریای خواردنی ماڵی هەتیو بن

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا﴾(النساء: ١٠) واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە ماڵی هەتیووان بە ناحەق و ستەم دەخۆن، بێگومان ئەوانە تەنها ئاگر دەخۆن و ئەو ماڵە دەبێتە ئاگر لە سکیاندا، لە قیامەتیشدا دەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولًا﴾(الاسراء: ٣٤) واتە: نزیك ماڵی هەتیو مەکەون مەگەر بە جوانترین شێوە نەبێت (وەك ئەوەی بیخەنە بازرگانییەکەوە تا گەشە بکات) هەتا ئەگاتە هەرەتی لاوی، وەفا بکەن بە بەڵێن و پەیمان، چونکە بەڕاستی بەرپرسیارن لە بەرامبەر بەڵێن و پەیمانەوە.

## ناپاکی لە تەرازوو

براکەم، لە ناپاکیکردن لـە کێشـان و پێوانـە دووربکـەوە، خـوای گەورە فەرمانی پێت کردووە دادپەروەر بیت، فەرموویەتی: ﴿أَوْفُـوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تَعْثَـوْا فِـي الْـأَرْضِ مُفْسِـدِينَ﴾(هود: ٨٥) واتـە: بـا پێـوان و کێشـانتان تێـر و تەواوبێت و بە دادپەروەرانە ئەنجامی بدەن، شتومەکی خەڵکی کـەم نرخ مەکەن و (فێڵیان لێ مەکەن) و خراپەکاری مەکەن لـە زەویـدا و تۆوی خراپە مەچێنن.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ(١) الَّـذِينَ إِذَا اكْتَـالُوا عَلَـى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ(٢) وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ(٣)﴾(المطففـين: ١-٣) واتە: هاوار و ئاهو ناڵـە بـۆ تـەرازووبازەکان، ئەوانـەی کاتێـك شت لە خـەڵکی دەکـڕن بەتـەواوی، بـە زیـادەوە لێیـان وەردەگـرن، بەڵام کاتێك ش

تیان بۆ دەپێون، یان دەکێشن لێی دەدزنەوە و کەمیان دەدەنێ و فێڵیان لێ دەکەن.

وریابە نەکەیت مافی موسـڵمانان بـۆ خـۆت داپچڕیت چـونکە لـە ناپاکیدا بەرەکەت نییە و حەرامێکی کەم حەڵاڵێکی زۆر لەناودەبات.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ " : ثَلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ فَهُوَ مُنَافِقٌ ، وَإِنْ صَلَّى وَصَامَ ، وَزَعَمَ أَنَّهُ مُسْلِمٌ : مَنْ إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ " رواه البخاري ومسلم.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (سێ سیفەت هەن لە هەر کەسێکدا هەبن ئەوا دووڕووە ئەگەر نوێژ بکات و ڕۆژووش بگرێ: ئەگەر ئەمانەتی لە لا دانرا ناپاکی لێ بکات، ئەگەر بەڵێنیدا و شکاندی، ئەگەر دوا و درۆی کرد) حديث صحيح: رواه مسلم و البيهقي.

هەروەها لە فرتوفێڵ دوورکەوە چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ( ليس منا من غشنا) حديث صحيح: رواه مسلم و أحمد و الترمذي و أبو داود و ابن ماجة.

((هەر کەس فێڵمان لێ بکات لە ئێمە نییە.)

## مەیخۆری

مەیخۆری لە تاوانە گەورەکانە..بزانە لە مەیخۆریدا (١٠) خووی بەد هەیە:

یەکەم: مەی عەقڵ و هۆشی بخۆرەوەکەی دەبات و دەبێتە قەشمەری منداڵان و سووك و چرووك دەبێ.(ابن أبي الدنيا) دەڵێ:

سەرخۆشێکم دیت میزی دەکرد و بە میزەکەی دەموچاوی دەشوشت و دەیگوت: اللهم اجعلني من التوابين واجعلني من المتطهرين.

دووەم: ماڵ و سامان لەناودەبات و تەنبەڵی بەدواوەیە.

سێیەم: دوژمنایەتی و ڕق و کینە لەنێوان خەڵك دروست دەكات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ﴾(المائدة: ٩١) واتە: بەڕاستی شەیتان هەر دەیەوێت لە ڕێگەی مەی و قومارەوە دوژمنایەتی و بوغز و كینە بخاتە نێوانتانەوە و لە یادکردنی خوا و ناوە پیرۆزەکانی وێڵتان بکات، هەروەها سست و تەنبەڵتان بکات لە ئەنجامدانی نوێژەکان بەشێنەیی، ئایا ئیتر بەس نییە؟ ئایا کۆڵ نادەن؟

چوارەم: خاوەنەکەی لە تاموچێژی خواردن و قسەی ڕاست و ڕێك و پێك بێبەش دەکات.

پێنجەم: لە هاوسەرەکەی بێبەشی دەکات و لەبەرئەوەی زۆر سوێند بە تەڵاق دەخوات بۆیە لەگەڵیدا لەسەر زینا دەژی..لە

هەندێ هاوەڵ گێڕدراوەتەوە کە گوتوویانە: هەر کەسێك کچی خۆی بداتە مەیخۆر ئەوا بۆ زینای ڕەوان کردووە.

شەشەم: کلیلی هەموو خراپەیەکە و تووشی هەموو بێفەرمانییەکی دەکات.

حەوتەم: ئازاری ئەو فریشتانەی پێ دەدات، کە بۆ پاراستنی هەموو کەسێك دانراون ئەویش بەوەی تووشی مەجلیسی خراپەکاری و بۆنی ناخۆشیان دەکات.

هەشتەم: خۆی تووشی لێدانی هەشتا قامچی لە دونیا کردووە، ئەگەر لە دونیاش لێی نەدرێ لە ئاخیرەت بە بەرچاوی هەموو خەڵکەوە لێی دەدرێ.

نۆیەم: دەرگای ئاسمان بە ڕووی خۆی دادەخات و کردەوەی بەرز ناکرێتەوە و چل ڕۆژان دوعای لێ وەرناگیرێ.

دەیەم: خۆی و دینەکەی خستۆتە مەترسییەوە و دوور نییە لە کاتی مردنیدا ئیمانی لێ بسەنرێتەوە..پیاو هەبووە لە کاتی سەرەمەرگ بینراوە و پێیان گوتووە: بڵێ: لا إله إلا الله...کەچی ئەو گوتوویەتی: شەڕابم بدەنێ.

ئەمانە تەنها سزای دونیان، سزای دواڕۆژیش ئەوا دەبێ ئاوی بەکوڵ و زەقووم و کێم و زووخاوی ئەهلی ئاگر بخواتەوە..

## ناوەڕۆك

(ابن الجوزی) یەکێکە لە زانا گەورەکانی ئیسلام و خاوەن دەیان دانراوی بەنرخە، لە ساڵی ٥١٠ی کۆچی لە شاری بەغداد لەدایك بووە و زانست و زانیارییەکانی ئەو سەردەمەی لەسەر دەستی زانا و فەقیهە گەورەکانی ئەوسای جیهانی ئیسلام وەرگرتووە..سەرەتای ژیانی بە سۆفیگەرێتی دەست پێکردووە، بەڵام دواتر وازی لە ڕێچکەی سۆفیگەرێتی هێناوە و خووی داوەتە دانانی کتێب و ئامۆژگاریی موسڵمانان..لە بواری وەعز و ئیرشاددا وێنەی کەم بووە و هەزاران کەس بە هۆی مەجلیسەکانی ئامۆژگاریی ئەمەوە تەوبەیان کردووە..(ابن الجوزی) لە ئاکامی نەخۆشییەکەوە لە ساڵی (٥٩٧)ی کۆچی لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە..

نرخ: ٣٥٠٠ د.ع


ISBN 978-1-7732238-0-3